زنجیرەی ئیسلام و زانست

1

# قورئان و ڕوەکناسی

ئامادەکردنی
سەروەر ڕەحمان

قورئان و زانست

6

زنجیرەی قورئان و زانست (٦)

# قورئان و ڕووەکناسی


ئامادەکردنی

**سەروەر حەسەن**

پێداچوونەوەی زانستی و پێشەکی

**د.جلال حمەصالح بۆسکانی**

کۆلێژی کشتوکاڵ/ زانکۆی سلێمانی

پێداچوونەوەی زمانەوانی

**م. محمد شریف صالح**

بەکالۆریۆسی زمانی کوردی




ناوی کتێب بەکوردی: قورئان و ڕووەکناسی

ئامادەکردنی: سەروەر حەسەن

پێداچونەوەی زانستی: د.جلال حمەصالح بۆسکانی

پێداچونەوەی زمانەوانی: م. محمد شریف صالح

بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر

نەخشەسازی ناوەوە: جمعە صدیق کاکە

خەت: نەوزاد کۆیی

بەرگ: أمین مخلص

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٣٢٠ ) ساڵی ٢٠١١ پێدراوە



تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨

مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com

## ناوەرۆك

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەكی

به قەڵەمی د. ئەفرام محمد حسن

سوپاس و ستایش بۆ خـوای گـەورە، هـەزاران درووود وسـلاو بۆ گیـانی پاكی پێغەمبەری ئازیز و یارو یاوەرانی تا ڕۆژی دوایی...

قورئان پەرتوكی خـوای گەورەیـه و بـۆ مرۆڤایـەتی دابـەزیوە و لێیـەوە مرۆڤ فێری چۆنیەتی ژیان و ڕێكخستنی پەیوەنـدیی دەبێـت لەگـەڵ خـود و خوا و خەڵك و گەردوون.

قورئـان وتـەی خـوای میهرەبانـە، لـە قورئانـدا خـوای بـە بـەزەیی و بەخشنده بۆ مرۆڤ دواوە، وتەی خۆیی بـۆ نـاردووە، لـە هەنـدێك مەسـەلەدا ئەو زاتە مەزنـەی توانـای بێسـنووری بەسـەر هـەموو نهێنـی و ئاشـكراكاندا هەیە سوێندی بۆ مرۆڤ خواردووە، مرۆڤێك كە وەك قەوارە و هێـز و زانسـت بەرامبـەر پـەروەردگار هـیچ نییـە، هـیچ هـیچ... ئـەو خوایـە ڕێـزی لێنـاوە ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾.

خوای گەورە وایكردووە ئێمە لە وتەكانی تێبگەین، ئەمـەش یەكێكـە لـە گەورەترین بەخششەكانی بۆ مرۆڤ.

ئەم قورئانە هەموو لایەنەکانی پەیوەست بە ژیانی مرۆڤی گرتوەتەوە و هیچ لایەنێکی فەرامۆش نەکردووە (سیفەتێکی ئەم قورئانە ئەوەیە گشتگیرە و بۆ هەموو سەردەمەکانە). یەکێك لەو لایەنانە ئاماژە زانستییەکانی ئایەتە قورئانییەکانە کە ئێستا قوتابخانەی ئیعجازی زانستی لێکۆڵینەوەیان دەربارە دەکات.

جێی ئاماژەیە هەندێك لەو توێژینەوانەی دەربارەی ئەو ئایەتانە کە ئاماژەی زانستیان تێدایە، دەتوانرێت پێیبوترێت ئیعجازی زانستی قورئان، بەڵام هەندێکی تریان لەوە بەدەر نین کە ڕاڤەیەك یان خوێندنەوەی زانستی بن بۆ ئایەتەکان.

خوێنەری بەڕێز! ئەم کتێبەی بەردەستت یەکێکە لەو زنجیرە شەش بەرگیەی دەربارەی ئایەتە زانستییەکانی قورئانی پیرۆز (کە لەماوەی پێنج تا شەش ساڵدا) ئامادەکراوە: "قورئان و گەردوونناسی، قورئان و زەویناسی، قورئان و دەروونناسی، قورئان و زانستی پزیشکی، قورئان و ئاژەڵناسی لەگەڵ قورئان و ڕووەکناسی"... ئێمە لەم زنجیرەیەدا خۆمان پەیوەست نەکردووە بەوەوە کە سەرجەم بابەتە هەڵبژێردراوەکان لەڕووی ئیعجازیوونیانەوە ساغ کرابنەوە، بەڵکو ئیعجازیبوونی هەندێك لە باسەکانی نێو ئەم زنجیرەیە سەلمێنراون و هەندێکی تریشیان تەنها خوێندنەوەیەکی زانستی و هاتنەوەی زانستە لەگەڵ ئایەتەکاندا.

لەڕاستیدا جگە لە "قورئان و دەروونناسی" کە وەرگێڕدراوی بەشێکی زۆر لە بابەتەکانی نووسراوێکی "ئەندازیار عبدالدائم الکحیل"ە کە توێژەر و چالاکێکی بواری ئیعجازی زانستییە، سەرجەم بەرگەکانی تر ئامادەکراون (بابەتەکان لە کتێب و سیدی و پێگە ئەلیکترۆنییەکانەوە هەڵبژێردراون و وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی).

لەلایەکی ترەوە لەم زنجیرەیەدا خۆمان پەیوەست نەکردووە بەوەوە کە بابەتەکان بە دووررودرێژی و سەرجەم وردەکارییەکانیانەوە باس بکەین، بەلکو زۆرینەی بابەتەکان کورت و پوختن، هەولماندادوە زۆربەی هەرە زۆری ئایەتە زانستییەکان لە بوارە دیاریکراوەکاندا لەخۆبگرن.

خالێکی گرنگ کە تایبەتمەندی ئەم زنجیرەیەیە، پێداچوونەوەی زانستی و زمانەوانییە لەلایەن پسپۆڕانی بوارەکانەوە. ڕێز و خۆشەویستی بێپایانم بۆ یەك یەکی ئەو بەڕێزانە هەیە کە ئەرکی پێداچوونەوەیان لەئەستۆگرت.

ئەو مامۆستا و هاوڕێ ئازیزانەم کە پێداچوونەوەی زانستیان بۆ بابەتەکان کرد، بەڕاستی کارەکەیان زیاتر زانستی کرد، تێبینی و سەرنجی ورد و زانستیانەیان دەربارەی تاك تاکی بابەتەکان پێدام، یان پێباشبوونیان پێوتم، خۆشحالبووم ئەو ئازیزانە بوونە هاوکاری ئەم کارە سادەیمان، دەبێت خوای گەورە خۆی پاداشتیان بداتەوە.

لەلایەکی تریشەوە ئەو خوشك و برایانەم کە پێداچوونەوەی زمانەوانیان بۆ زنجیرەکە ئەنجامدا گەلێك جوانکاری و ڕاستکاریان بۆ کارەکە کرد، چاکنووسی و جواننووسیان بۆ شێوازی دارشتن و وشە و دەربڕینەکان پەسەندکرد، دەستخۆشی و نزای خێرم بۆیان هەیە.

لەگەل ئەوەشدا دیارە هەر کارێك خاوەنەکەی مرۆڤ بوو، لە کەموکوڕی بەدەر نییە. هەر هێندە دەتوانین و دەزانین داوای لێخۆشبوون و پێدانی حیکمەت لە خوای گەورە بکەین.

خوای گەورە دلسۆزی و دانایمان پێبدات و بەمیهرەبانی خۆی ئەو کارانەی کە خۆمان بەباشیان دەزانین، لێمان وەربگرێت.

سەرومر حسن

سلێمانی/ ٢٠١٠

# فاكتەرەكانی سیستمی كشتوكاڵی
# (باران و خاك و ڕووەك)

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا
﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾
وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ﴾عـبس/٢٤-٣٢، واتـە: دەبا مرۆڤ سەیری خواردنەكەی بكات و سەرنجی بدات و بیری لێ بكاتـەوە. بێگومان ئێمە ئاومان بۆ داباراندووەتە خوارەوە، چۆن داباریننێك؟ لەوەودوا زەویمان لەت لەت كرد بە چەكەرەی ناسكی ڕووەك، ئینجا دانەوێڵەمان تێدا ڕوانـد، هـەروەها تـرێ و سـەوزە، زەیتـون و دارخورمـایش، باخچـەی دەورەدراو بە دارخورما یان داری تر، یـاخود بـاخی چـڕوپڕ، چەندین جۆر میوە، لەگەڵ هەموو ئەو گژوگیایانەی كـە خـواكردە و مـاڵات دەیخـوات لـە لەوەڕگاكاندا، (هەموو ئەمانەمان ئامادە كردووە) تا خۆتـان و ماڵاتـەكانتان سوودی لێوەربگرن.

ئەم ئایەتانە ئاماژە بە سێ فاكتـەری سـەرەكی كەشوهەوا دەكـەن كـە مـەودای سـەركەوتوویی كـرداری كشـتوكاڵی دیـاری دەكـەن، ئـەوەش هاوكێشەیەكە سێ ڕەگەز لەخۆدەگرێت:

١. بـاران ﴿أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا﴾: هـەموو ئـەو كاریگەرییانـەی كەشـوهەوا دەگرێتەوە كە یارمەتی بـاران بـارین دەدەن، وەك: هـەور و گـەرمی و بـا و كرداری هەڵمین.

٢. خاك ﴿ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا﴾: ئاماژەیە بە پێویستی زەوی و كێڵان، بۆ دەستكەوتنی بەروبوومی كشتوكاڵی باش و چاك.

٣. ڕووەك ﴿فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا﴾: ئـەوەش جـۆری تـۆوە بـەكارهاتووەكان دەگرێتەوە.

ئەم ڕاستییانەی قورئانی پـیرۆز باسـی لێـوەكردوون بنـەماكانی زانسـتی "ئەندازیاریی كشتوكاڵی" لەسەر دامەزراوە كە لە زانكۆكان دەخوێنرێـت... بەر لە دەستپێكردن بە هـەر پرۆژەیـەكی كشـتوكاڵی پێویستە لێكۆڵینـەوە لەسەر فاكتەرەكانی كەشوهەوای ئەو ناوچەیە بكرێـت، لەگـەڵ دیـاریكردنی سەرچاوە ئاوییەكانی و شیكردنەوەی جۆری ئاوەكەی و ڕێـژەی سـوێرێتی. هەروەها پێویستە لێكۆڵینەوە دەربارەی جۆری خاكەكەی و زانینی ڕێـژەی ماددە كانزایی و ئەندامییەكان بكرێت، ڕێژەی قوڕ (Clay) و لیتە (Slit) و قوم (Sand)، پاشان لەژێر ڕۆشنایی ئەو زانراوانەدا جۆری ڕووەكـی شیاو بـۆ ئـەو خاكـە دەستنیشـان دەكرێـت لەگـەڵ سـوڕی شیاوی كشـتوكاڵی و جۆری تۆوەكان.

# جیاوازی سروشتی زەوی

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ﴾ الأعـراف/٥٨، واتـە: وڵاتـی بـەپیت و چـاك و ئـاوەدان دار و ڕووەكـی تێـدا دەڕوێت بە فـەرمانی پـەروەردگاری، ئـەوەش كـە ژەنـگ و پـیس و بێكـەڵك بێت، شتی بێسوود و بێفەڕ نەبێت هیچی لێ پەیدا نابێـت، ئـا بەوشـێوەیە بەڵگـە و نیشـانەی جۆراوجـۆر دەهێنینـەوە بـۆ كەسـانێك كـە دڵسـۆزن و سوپاسی خوا دەكەن.

خاكی كشتوكاڵی لە زەوییەكەوە بۆ یـەكێكی تـر دەگۆڕێـت، بـەگوێرەی پلـەی جۆرچـاكی: زەوی لمـین هەیـە، زەوی قـوڕین، زەوی خوێـدار یـاخود زەوی بیابان و جگە لەوانەش.

ئەم جیاوازییە لە سروشتی زەویدا لـە گرنگترین ڕێسـا كشـتوكاڵییەكانە كـە لـەكاتی لێكۆڵینـەوە لـەو زەوییانـەدا ڕەچـاو دەكـرێن، ئـەم ڕاسـتییە زانستییە لە قورئانی پیرۆزدا پێشینەی هەیە.

لـە گـرنگترین هۆكارەكـانی جیـاوازی لـە جـۆری زەوی كشـتوكاڵیدا، جیاوازییـە لـە قـەبارەو ژمـارەی كونیلـەكانی نێـو خـاك. بـۆ نموونـە زەوی قـوڕینی ڕەش ئـاو گـل دەداتـەوە، چـونكە كونیلـەكانی تەسـكە، ئـەوەش یارمەتی دەدات لە پارێزگاریكردنی ئاو، لە كاتێكدا زەوی لمـین بـە خێرایـی

ئاوی پێدا ڕۆدەچێت، چونكە كونیلەكانی فراوانە و ناتوانێت پارێزگاری ئاوی سەر ڕووەكەی بكات.

دابەزینی ئاو بە زەویدا دەبێتەهۆی بەرزكردنەوەی ئەو هەوایەی لە كونیلەكاندا هەیە، بەوەش ئاوەكە جێی هەواكە دەگرێتەوە، هەربۆیە قوڕ بە ئاو دەكشێت و بە وشكبوونەوە دەچێتەوەیەك.

## زەوی ئاست بەرز بۆ كشتوكاڵ باشترە

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ﴾البقرة/٢٦٥، واتە وەك باخچەیەك وایە، لە بەرزاییەكدا بێت و بارانێكی دڵۆپ گەورە بیگرێتەوە و ببێتەهۆی ئەوەی كە دوو بەرامبەر بەرهەمی هەبێت، خۆئەگەر بارانی دڵۆپ گەورەش نەیگرێتەوە، ئەوە نمەباران پاراوی دەكات.

ئەم ئایەتە ئاماژە بەوە دەدات زەوی بەرز باشترە بۆ كشتوكاڵ، ڕەنگە بەرهەمی ئەو زەوییە دوو هێندی ئەو بەرهەمە بێت كە زەوی نزم دەیدات.

زانستی كشتوكاڵیی نوێ سەلماندوویەتی هەرچەند ئاستی زەوی بەرز بێت، ئاستی ئاوی ژێر زەوی نزمتر دەبێت، هێندەش كشتوكاڵ و بەروبووم باشتر دەبێت. ئەوەش هاوتایی تەواو لە نێوان زانستی كشتوكاڵیی نوێ و قورئانی پیرۆزدا دووپات دەكاتەوە.

ئەگەر زەوی بەرز بەلێشاو و زۆر ئاودێری كرا ئەوا بەشی پێویستی خۆی وەردەگرێت و ئاوە زیادەكەش بەتەواوی بە زیاد دەڕوات، بەلام ئەگەر

هاتوو ئاودێرییەكی كەم كرا ئەوا پێویستی خۆی دەست دەكەوێت بێئەوەی ئاو بمێنێتەوە كە پێویست بە خۆ لێ ڕزگاركردن بكات. لەسەر ئەم بنەمایەیە مەسەلەكانی بەكارهێنانی ئاو بوونەتە جێی بایەخدان.

لەو ڕاستییە زانستییانەی ئایەتە پیرۆزەكە ئاماژەی پێداوە ئەوەیە كە هۆكاری ئاودێری ئەگەر ڕاستەوخۆ لە بارانەوە بوو، باشترە لە ئاودێری لە ڕووبار و دەریاكانەوە، چونكە لە كەشدا ئەو ڕەگەزە دەگمەنانە هەن كە لەگەڵ دڵۆپە بارییوەكاندا دەتوێنەوە، ئەوەش دەبێتە هۆی كەوتنەخوارەوەی ڕاستەوخۆی ئەو ماددانە بۆ سەر ڕووەكەكان و وەرگرتنیان لە لایەن ڕووەكەكەوە، بەوەش گەشەكردنی دوو هێند دەبێت.

## ( بـــا ) هۆكاری پیتێنە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ ﴾الحجر/٢٢، واتە: ئێمە (با) مان كردووە بە هۆكاری پیتێنەری ڕووەك، و هەر بەهۆی (با)وە باران لە ئاسمانەوە دەبارێنین و ئێوەی پێ تێرئاو دەكەین، بێئەوەی ئێوە ئەو ئاوانەتان ئەمبار كردبێت.

لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا هاتووە: با هۆكاری پیتاندنە بۆ دار و هەور. "إمام طبري" دەڵێت: "با هەڵگری هەور و خێرە".

لای زانایانی ڕووەكناس بووەتە زانیارییەكی چەسپاو كە تۆوی نێرە (هەلاڵە) كردن بەسەر مێیەكاندا (واتە كرداری پیتاندن) كردارێكی بنەڕەتی

پیتاندن و دروستبوونی تۆوی ڕووەکە. لەکاتێکدا کە دەنکەهەڵاڵەکان (Pollen Grain) لە ئەندامەکانی نێرینەوە لە گوڵدا (Anthers) دەگوێزرێنەوە بۆ ئەندامەکانی مێیە تیایدا (Stigma)، پاشان پیتێن ڕوودەدات.

کرداری پیتاندن دەگونجێت لەنێوان ئەندامەکانی نێرە و مێیەی هەمان گوڵ یان هەمان ڕووەکدا ڕووبدات، لەم کاتەدا بە کردارەکە دەوترێت (پیتاندنی خۆیی Self Pollination). دەشگونجێت کردارەکە لەنێوان دوو ڕووەکی جیاوازدا بێت، لەم کاتەشدا پێیدەوترێت پیتاندنی تێکەڵی (Cross Pollination).

ڕێگاکانی گواستنەوەی دەنکە هەڵاڵەکان بەپێی جۆری ڕووەکەکە دەگۆڕێت، لێرەدا وێڕای ئەو پیتاندنەی مرۆڤ بەدەستی خۆی دەیانکات – بۆنمونە وەك ئەوەی بۆ دارخورما دەیکات– سێ ڕێگای تر هەیە، ئەوانیش:

١. پیتاندن بەهۆی ئاژەڵەوە، وەك مێرووەکان.
٢. گواستنەوە و پیتاندن بەهۆی ئاوەوە.
٣. پیتاندن بەهۆی باوە.

وەك لە ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیدا هاتووە، (با) ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە گوێزانەوەی دەنکەهەڵاڵە لەو ڕووەکانەوە کە گوڵی بۆن و ڕەنگداری کێشکاریان نییە بۆ مێرووەکان، بۆیە (با) هەڵدەستێت بە بڵاوکردنەوەی هەڵاڵە بۆ دووریی زۆر. بۆنموونە (با) دەنکەهەڵاڵەی سنەوبەر (Pine) بڵاودەکاتەوە بۆ دوورییەك دەگونجێت بگاتە (٨٠٠ کیلۆمەتر) بەر لەوەی هەڵاڵەکە بگاتە ئەندامی مێینە و پیتێنەکە ڕووبدات.

لەو ڕووەکانەی بەشێوەیەکی بنەڕەتی پشت بە پیتاندن دەبەستن بەهۆی (با)وە، سنەوبەرییەکان و گیا گەزنە (قُراص) و چنار (ألحور) و

بەڕوو (سندیان) و گوش (قُنّب) و داری بوندوقە.

لـە ئینسـایكلۆپیدیای بەریتانیـدا هـاتووە: ئـەو هۆیـەی وادەكـات بڵاوبوونەوەی دەنكەهەڵاڵە بەهۆی (با)وە ئاسان بێت ئەوەیە كە ئەندامە نێرینـەكانی گـوڵ كـە دەنكەهەڵاڵـە بەرهـەم دێـنن، بەركەوتـەن بـە هـەوا، بەشێوەیەك كـە بڵاوبوونـەوەی دەنكەهەڵاڵـەكان ئاسـان دەكـەن. لەلایـەكی تریشـەوە، گـوڵ لـە بـەرزترین خـاڵی دار یـان ڕووەكەكەدایـە و گـەڵا لـە بەردەمیدا نییە.

لە ئینسایكلۆپیدیای جیهانیدا هاتووە: پیتاندن بەهۆی (با)وە خەسڵەتی ئەو ڕووەكانەیە كە گوڵی جیاكەرەوەیان نییە و بۆنی خۆشی ئەوتۆیان نییە مێرووەكان بۆخۆیان كێش بكەن. لەم ڕووەكانەدا تەنها بڕێك دەنكەهەڵاڵەی وشكی سوك بەرهەم دێت و (با) هەڵیدەگرێت و بۆ دووریی زۆر لەگەڵ خۆیدا دەیبات تاكو دەیگەیەنێتـە ئەنـدامی مێینـە. ئـەم ئەنـدازە هەڵاڵەیـە كـە لـە هەوادا هەن هۆكاری سەرەكین بۆ ئەو (تا)یەی بە (حمّـى القش) ناسـراوە و توشی ئەو كەسانە دەبێت كە هەستیارییەكی زۆریان هەیە.

هـەروەها لـە ئینسـایكلۆپیدیای بەریتانیـدا هـاتووە: بـۆ ئاسـانكردنی بەركەوتەیی بە (با)، زۆرجار لە بەهاردا گوڵ لـەپێش گـەڵاوە گەشـەدەكات، یـاخود ڕەنگـە لـە بـەرزایی دار یـان ڕووەكـدا گـوڵ گەشـەبكات، زۆرجـار كۆسپەكانیان درێژ و چەماوەیە بۆئەوەی ڕووبەرێكی فراوانتریان هـەبێت بـۆ وەرگرتنی دەنكەهەڵاڵەكان.

كەواتە ڕووی ئیعجازی ئایەتەكـە ئـەو ئاماژەیەیـە كـە "بـا هەڵدەسـتێت بەكرداری پیتاندنی ڕووەكەكان".

﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ ﴾.

# دوانەیی و پیتێن لە ڕووەکەکاندا

هەروەك لەجیهانی مرۆڤ و ئاژەڵەکاندا نێر و مێ هەیە، لە جیهانی ڕووەکیشدا بەهەمان شێوەیە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾الذاریات/٤٩، واتە: لە هەموو شتێك ئێمە جووتمان دروست کردووە، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە و یاداوەری وەربگرن.

﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنْفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾یس/٣٦، واتە: پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەر هەموو بەدیهێنراوەکانی بە جووت دروستکردووە لەوەی لە زەویدا دەڕوێت، لە خۆیشیان، لەو شتانەش کە نایزانن.

﴿فِيهِمَا مِنْ كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾الرحمن/٥٢، واتە: لە هەموو جۆرە میوەیەك نموونەی دوانەیان تێدایە.

﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾الرعد/٣، واتە: خوا ئەو زاتەیە کە زەوی پان و بەرین کردووە و کەژ و چیا و ڕووباری زۆری تێدا دابینکردووە، لە هەموو بەروبوومێك جووتی فەراهەم هێناوە لە هەردوو ڕەگەز، شەوی والێکردووە ڕۆژ داپۆشێت، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك بیربکەنەوە.

﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴾طه/٥٣، واتە: ئەو زاتەی زەوی بۆ ئێوە بار هێناوە، وەكو لانكە (لەسەری دەحەوێنەوە)، هەروەها جۆرەها ڕێگای تێدا بۆ فەراهەم هێناون، لە ئاسمانیشەوە باران دادەبارێنێت، كە بەهۆیەوە چەندەها جووت ڕووەكی پێڕواندووە.

ڕاگەیاندنی بیردۆزی پیتاندن و بوونی نێر و مێ لە هەموو بەروبوومە ڕووەكییەكاندا، لە ئایەتەكەدا هەیە، دروست وەك ئەوەی سوننەتی ژیانە لە مرۆڤ و ئاژەڵ و باڵندەكاندا.

وەك ژیانی مرۆڤ كە بە كۆرپەلەیەكی بچوك دەستپێدەكات، دایك پەروەردە و چاودێری دەكات. ژیانی ڕووەكیش وەك كۆرپەلەیەكی بچووك دەنكۆڵە پەرەی پێدەدات، لە ماوەی ڕوان و گەشەكردنیدا خۆراكی پێویستی بۆ بەدەست دەهێنێت. كۆرپەلەكەش بەهێمنی و جێگیری دەمێنێتەوە تاكو زەوی باوەشی بۆ دەكاتەوە و بارودۆخی گونجاوی بۆ ئامادە دەبێت وەك گەرمی و ئاو، دەنكۆڵە و تۆوەكان دوو كەرت دەبن (دەتروكێن) و كۆرپەلەكە گەشە دەكات. كە گەشەی ڕووەكەكە تەواو بوو و گەیشتە تەمەنی پێگەیشتن، گوڵەكانی دەكرێنەوە و بەروبووم بەرهەم دێت.

زانستی نوێ ئاشكرایكردووە گوڵی ڕووەكەكان –بە جیاوازی جۆرەكانیانەوە– دابەش دەكرێن بۆ سێ جۆر:

گوڵی نێر– گوڵی مێ– گوڵی دووڕەگ (كە هەردوو ئەندامی نێرە و مێیەی پێكەوە تێدایە).

ئەو گوڵانەی لە هەوادا دەپیتێن بەوە جیادەكرێنەوە ئەندامەكانی زاوزێیان بەركەوتەی هەوان. هەركات (با) لەراندنیەوە دەنكە هەڵاڵەكانیان

لیّ دەكەویّتــە خـوارەوە، دەنكەهەلاڵـەكان دەكەونـە خـوارەوە كـە سـوك و لوسن تاكو هەلگرتنیان لەلایەن هەواوە ئاسان بیّت بۆ سەر ئەندامی میّیـەی گوڵی تر و پاشان كرداری پیتیّن ڕوودەدات.

پـەروەردگار دەفـەرمویّت: ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَـٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَـٰزِنِينَ ﴾الحجر/٢٢...

## ویّڕای هەمان زەوی و هەمان ئـاو ڕووەكەكان جۆراوجۆرن

پــــەروەردگار دەفـــــەرمویّت: ﴿ وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَـٰوِرَٰتٌ وَجَنَّـٰتٌ مِّنْ أَعْنَـٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾الرعــــد/٤، واتــــە: لەسەر ڕووكاری زەوی پارچەی جۆراو جۆر هەیـە لـە پـاڵ یەكدا، هـەروەها ڕەزی تریّ، بەروبوومی هەمەجۆر لـە دانەویّڵـە و بیّسـتانەكاندا، دارخورمـای یەك قەد و دوو قەد، هەموو ئەمانە بە یەك ئـاو ئـاو دەدریّن و لـە یـەك ئـاو دەخۆنەوە و هەندیّكیانمان لە هەندیّكی تر بۆ خۆراكی ئادەمیزاد نـازدارتر و پەسەندتر كردووە، بەڕاستی لە لەو شتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هـەن بـۆ كەسانیّك ئەقڵ و ژیری خۆیان بخەنەكار.

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾الشعراء/٧-٨، واتە: ئایا سەرنجی زەوییان نەداوە و لێی ورد نەبوونەتەوە، چەندین جووت ڕووەکی بەنرخی هەمەجۆر و ڕازاوەمان تێدا ڕواندووە. بەڕاستی ئا لەوەدا بەڵگە و نیشانە هەیە، کەچی زۆربەیان باوەڕدار نەبوون.

وێڕای ئەوەی ڕووەکەکان بە یەك ئاو ئاودەدرێن، بەڵام هەر جۆرە ڕووەکە سروشت و تایبەتمەندی خۆی هەیە، لەگەڵ پێداویستی و کەشوهەوای تایبەت، وادەیەك بۆ کشتوکاڵ، کاتێك بۆ بەرهەم... لەهەمان زەوی و لە یەك ئاو، ڕووەکەکان هاوسێی یەکترن، کەچی هەندێکیان لە شێوە و تام و ڕەنگدا لە هەندێکی تریان باشترن.

ڕووەك خۆراك وەردەگرێت و گەشەدەکات، بۆ گەشەکردنی هەر دەبێت ڕووناکی و ئاو هەبێت، لەگەڵ کاربۆن، ئۆکسجین، هایدرۆجین، فسفۆر و کبریت و پۆتاسیۆم، کالسیۆم و مەگنسیۆم و ئاسن و...

جێی سەرسامییە سەرجەم ڕووەکەکانی ئەم جیهانە لەسەر هەمان ئەو توخمانە دەژین، لەگەڵ ئەوەشدا لە زەویدا سێو و ترێی شیرین دەڕوێت، تالگەی تاڵ، پەمووی نەرمونیان، گەنم و جۆو پرتەقاڵ و... توخمە خۆراکییەکان یەکن، خاکیش یەکە، ئاو یەکە، تۆوەکان لەوپەڕی وردی و بچوکیدان، هەزاران جۆر و شێوەیان لێوە دەردەچێت بە بۆن و تامی جیاواز...

خوای پەروەردگار هەموو ڕووەکەکانی بەجۆرێك خوڵقاندووە کە لەگەڵ ژینگەکەیاندا بگونجێن.

# میوە پێش گۆشت

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ (٢٠) وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ﴾الواقعة/٢٠-٢١، واتە: میوەشیان بۆ دەگێڕن، بە ئارەزووی خۆیان لێی هەڵدەبژێرن، گۆشتی هەر باڵندەیەکیش کە حەزی لێبکەن بۆیان ئامادەیە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَمۡدَدۡنَٰهُم بِفَٰكِهَةٖ وَلَحۡمٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ﴾الطور/٢٢، واتە: بەردەوام حەزیان لە هەر میوە و گۆشتێك بێ پێشکەشیان دەکەین.

زانستی پزیشکی نوێ و خۆراکناسی ئاشکرایانکرد کە خواردنی میوە لەپێش ژەمە خۆراکییەکان سودگەلێکی تەندروستی هەیە، چونکە میوە شەکرە سادەکانی تێدایە کە بە ئاسانی هەرس دەکرێن و خێراش دەمژرێن، ڕیخۆڵەکانیش لە ماوەیەکی کورتدا (کە بە چەند خولەکێك مەزەندە دەکرێت) ئەو شەکرانە دەمژن و جەستە پێیان دەبوژێتەوە و نیشانەکانی برسێتی و کەمی شەکر نامێنێت. ئەگەر هاتوو کەسێك ڕاستەوخۆ گەدەی پڕ لە خۆراکی جیاواز بکات، پێویستی بە نزیکەی سێ کاتژمێر دەبێت تاکو ئەو شەکرەی تێیدایە دەیمژن، بۆیە بۆ ماوەیەکی درێژ نیشانەکانی برسێتی دەمێننەوە.

شەکرە سادەکان، وێڕای سادە هەرسبوون و مژینیان، سەرچاوەیەکی بنەڕەتی وزەی خانە جیاوازەکانی جەستەشن. لەو خانانەی سوودێکی خێرا لە شەکرە سادەکان دەبینن دیواری ڕیخۆڵەکانن، کە بەخێرایی چالاك

دەبنـەوە کاتێـك شـەکری میوەیـان پێـدەگات، ئامادەباشـیش دەبـن بـۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکان بە باشترین شێوە (لە مژینی جۆرە جیاوازەکانی خۆراك کە کەسەکە لەدوای میوە دەیانخوات).

ڕەنگە ئـەوە حیکمـەتی پێشخسـتنی میـوە بێـت بەسـەر گۆشـتدا، وەك شێوازی ئایەتە پیرۆزەکە.

# خاکیش وەك وڵاتێك وەهایە

خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا﴾الأعراف/٥٨، واتە: وڵاتی بەپیت و چـاك و ئـاوەدان، دار و ڕووەکی بە فەرمانی پەروەردگاری تێدا دەڕوێت، ئەوەش کە زۆنـگ و پیس و بێ کەڵك بێت، شتی بێسوود و بێفەڕ نەبێت، هیچی لێ پەیدا نابێت.

خـوای پـەروەردگار خـاکی بـە وڵات نـاوبردووە و ئـەوەش بـە لوتکـەی ئیعجازی زانستی دادەنرێت، خاك بە پێکهاتەکانیەوە هەر وەك وڵاتێکە.

لێکۆڵینـەوە زانسـتییە کشـتوکاڵییەکان سـەلماندوویانە هـەر یـەك مـەتر سێجا لە خـاك کـە بـۆ کشـتوکاڵ بـەکاردەهێنرێت (٢٠٠ هـەزار) کـرم و (١٠٠ هەزار) مێـروو (حشـرات) و (٣٠٠) کرمـی ئاسـایی خـاك و هـەزاران میکـرۆب (زیندەوەری ورد)ی تێدایە... هەموو ئەوانەش بە چاوی ئاسایی نابینرێن.

هەر گرامێك لـەو خاکـە ملیـاران بـەکتریا و میکرۆبـی تێدایـە کـە لەسـەر ماددە ئەندامییەکان دەژین و دەیگۆڕن بۆ ماددەی کانزایی، بەدرێژایی ساڵ و بەبێ وەستان ئەم کارە دەکەن.

بۆ نموونە ئەو میکرۆبانە گەڵا وەریوەکان دەخۆن، ئەم کردارە پێویستی بە بوونی هەوا و ئۆکسجینی نێو خاك هەیە، بەڵام دەبێت ئەو هەوایەی نێـو خاك لەکوێوە هاتبێت؟

لێرەدا حیکمەتی بـوونی کرمـەکانی خـاك دەردەکـەوێن، چـونکە ڕۆڵێکـی گرنگ دەبینن لە کردنەوەی کونی زۆر لە خاکدا و هەوایش لێیانەوە دەچێتە خاکەکـەوە، واتــە لــە هــەواگۆڕکێی خاکـدا کرمــی زەوی بەشـداری دەکـات. هەروەها سەرجەم ئـەو ئاژەڵانـەی لـە خاکدا دەژیـن وەك مـار و مێروولـە و دووپشك، کونی زۆر لە خاکدا دروسـت دەکـەن. جێـی سەرسـامییە بوترێـت ئەگـەر ئـەو کونانـەی نێـو خـاك نـەمێنن ڕووەك لەسـەر زەوی نامێنێـت و ژیانیش کۆتایی دێت.

سەرجەم ئەو زیندەوەرانەی لەنێو خاکدا هەن وەك وڵاتێکـی ئاوەدانیـان لێکردووە، ئەوەش بەتەواوی لەگەڵ ئایەتەکەدا هاوتا دەبێت.

# بنەڕەتی سوتەمەنی داری سەوزە

پەروەردگار دەفـەرمویّت: ﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴾يس/٨٠، واتـە: ئـەو زاتـەی لـە داری سـەوز ئاگرتـان بـۆ بەدیدێنێت، ئیتر ئێوە دایدەگیرسێنن.

گـازی ئۆکسـجین کـە ڕێـژەی (٢١٪)ی پێکهاتـەی هـەوا پێکـدەهێنێت، فاکتەرێکی سەرەکی و پێویستە لە هەموو سوتانێك و دروستبوونی ئـاگردا. داری سەوز لە ڕێگای ماددەی کلۆرۆفیل یان پلاستیدە سـەوزەکانەوە کـە ڕەنگی سەوز دەبەخشێتە ڕووەك، دەبێتەهۆی دروسـتکردنی ئۆکسـجین لـە هەوادا.

داری سـەوز لـە ڕۆژدا دووەم ئۆکسـیدی کـاربۆن وەردەگرێـت و شیدەکاتەوە بۆ ڕەگەزە پێکهاتووەکانی، ئەوانیش بریتین لە ئۆکسجین کـە دەیکاتە دەرەوە لەگەڵ کاربۆن کـە ڕووەکەکـە لەخۆیدا دەهێڵێتـەوە و بـۆ دروستکردنی شانەکانی سوودی لێدەبینێت.

لەلایەکی ترەوە ئـاژەڵانیش لـە هەناسـەداندا بـە پێچـەوانەی ڕووەکـەوە گازی ئۆکسجین وەردەگرن، کە ڕەگەزێکی پێویستە بۆ هـەموو کردارەکـانی سوتانە کیمیاییەکانی نێو خانە.

کەواتـە ئەگـەر ڕووەکـی سـەوز نەبوایـە، ژیـان لەسـەر زەوی دروسـت نەدەبوو. یەکەمین ڕووخساری ژیان لەزەویدا دەرکەوتنی قەوزە سـەوزەکان بووە لە ئاودا (بەر لەسێ ملیار ساڵ پێشتر)، ئەمەش یەکەم مانای زانسـتی

ئایەتەکە دەبێت و کلیلی تێگەیشتنی ئایەتەکەشە کە لە وشەی ( الأخضر)دا شاردراوەتەوە.

سەرەڕای ڕۆڵی داری سەوز لە بەرهەمهێنانی ئۆکسجین و نوێکردنەوەی (کە هیچ سوتانێك بەبێ ئۆکسجین نابێت) بەهەمان شێوە خەڵوزی کاربۆنی (یان خەڵوزی بەردین)یش لە داری سەوز پێکهاتووە کە بەهۆی دیاردە سروشتییەکانەوە لە ناواخنی زەویدا شاردراونەتەوە و بە ماوەی ملیۆنان ساڵ گۆڕاون بۆ گرنگترین سەرچاوەی وزەی گەرمی لە زەویدا... بڕی ئەمبارکراوی خەڵوزی بەردین لە زەویدا نزیکەی هەشت ملیار تۆن دەبێت.

بەپێی ڕای زانایانی جیۆلۆجیا و کیمیای ئەندامی، دروستبوونی پەترۆڵ لەنێو زەویدا لە ڕووەك و ئاژەڵەکانەوەیە. بڕی ئەمبارکراوی پەترۆڵی زەوی بەنزیکەی دوو ملیار تۆن مەزەندە دەکرێت. هەروەها زۆر لە زانایان سەرچاوەی گازی سروشتیش بۆ ڕووەکی سەوز دەگێڕنەوە. بڕی ئەمبارکراوی ئەم گازەش لەزەویدا دەگاتە نزیکەی شەش ملیار مەتر سێجا.

بەکورتی لە کلۆرۆفیلی ڕووەکە سەوزەکاندا سوتەمەنی خۆر ئەمبار دەکرێت و لە بەشەکانی ڕووەکدا دەگۆڕێن بۆ ماددەی ڕووەکی کە خواردن و سوتانی ئاسانە. زانایانی جیۆلۆجیاش بنەڕەتی خەڵوزی بەردین و پەترۆڵ و سەرجەم داڕشتەکانی پەترۆڵ (وەك بەنزین و کیرۆسین و ...هتد) بۆ ڕووەکەکان دەگێڕنەوە کە بە خاك و بەرد داپۆشراون، یان ئاژەڵەکان کە خواردنیان لەسەر ڕووەکەکان بووە و لە ڕووەکەوە وزەیان وەرگرتووە. ئەمە وێڕای ئەوەی هەر ڕووەکی سەوز سەرچاوەیەکیشە بۆ پەیدابوون و هاوسەنگی ئۆکسجین لە هەوادا، کە بۆ سووتان گرنگە.

لە کۆی ئەم زانیارییانەوە تێدەگەین کە سەرجەم جۆرەکانی سوتەمەنییە بەکارهاتووەکان بنەڕەتیان لە داری سەوزەوەیە. بەم ڕاڤە

کورتەش لە ڕەهەندی زانستی ئەو ئایەتە پیرۆزە تێدەگەین کە دەفەرموێت: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ﴾الواقعة/٧١-٧٣، واتە: ئایا سەرنجی ئەو ئاگرە نادەن کە دایدەگیرسێنن، ئایا ئێوە ڕووەکەکەیتان دروستکردووە یا ئێمە فەراهەممان هێناوە؟ بێگومان هەر ئێمە کردوومانەتە هۆی ئەوەی یادخەرەوە بێت، هەروەها کردوومانەتە هۆیەك بۆ ئەوەی گەڕۆك و ماموشۆکەران کەڵکی لێوەربگرن.

## پوش و پەڵاشی وشك

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ﴾الأعلى/٤-٥، واتە: هەر ئەو زاتەیە کە گژوگیا دەردێنێت و دەیکاتە لەوەڕگا بۆ ئاژەڵ (بەڵام دوای ماوەیەك) دەیکاتە پوش و پەڵاشێکی زەرد و وشك و ڕەشهەڵگەڕاو.

(الغثاء) وشکییە و (أحوى) لە (الحوة) هاتووە کە لە (لسان العرب)دا بەمانای ڕەشی سەوزباو یان سوورێکی مەیلەو ڕەش هاتووە. بۆیە ڕاڤەی ﴿فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ﴾ واتە ئەوەی دوای سەوزیەتی کردوویەتی بە وشکێکی ڕەش. لێرەدا پرسیار ئەمەیە: ئایا ڕووەکێك هەیە کاتێك وشك دەبێت ڕەنگی ڕەش ببێت؟ بەدڵنیاییەوە ئەو ڕووەکانەی تا ئێستا ئێمە ناسیومانن، بەوجۆرە نین.

"جرترود هارتمان" دەڵێت: "ڕووەکەکان لە پێشترینی دیمەنەکانی ژیانن کە لەسەر ڕووی زەوی دەرکەوتوون. شانشینی ڕووەکی بەر لە شانشینی ئاژەڵی لەسەر ڕووی زەوی دەرکەوتوون، چونکە ئاژەڵ ناتوانێت بەبێ خواردنی ڕووەکەکان بژی. لەڕاستیدا ڕووەکە سەرەتاییەکان بەدەستی مرۆڤ نەڕوێنراون، چونکە لە پێش ڕووەکەوە مرۆڤ بەدی نەهێنراوە، بەڵکو ڕووەکەکان خۆیان هاتوون بێنەوەی مرۆڤ ڕواندبنی.

دیمەنی ژیانی ڕووەکی کە لەسەر زەوی بەدیهێنراون جۆراوجۆر و جیاوازن، بەشێوەی ناوچەی سەوز لەڕووەکە گوڵدارە چڕەکان و بەوەش گۆی زەوی بە پۆشاکێکی سەوزی زۆر جوان و بەرز لە ڕازاوەیدا داپۆشراوە کە ملیۆنانساڵ، بەڵکو هەزاران ملیۆن ساڵ، بەسەریدا تێپەڕیوە و گۆی زەویش بە ژمارەیەکی زۆری گۆڕانکاری گەردوونی و ژینگەیی توندا تێپەڕیوە.

زەوی توشی مەوسیمی بارانی بەلێشاو بووە، پاشان بەدوایدا چەند ماوەیەکی وشکی درێژ. چەندین جار توشی (با) و گەردەلوولی ترسناك بووە کە دارەکانی پەرشوبڵاو کردووەتەوە و ڕەگی ڕووەکەکانی لەبنەوە دەرهێناوە بەوەی جار دوای جار لە ئاوی لافاوی گەورەدا نقوم بوون. بۆیە شیبوونەوەیان بۆ ماددە ئەندامییە سەرەتاییەکان هۆکارێك بووە بۆ سازاندنی کەشی دووبارە ڕوانی ڕووەکی تری نوێ کە دووبارە ئەم ڕووەکە نوێیانەش ڕووبەڕووی گەردەلوول و ڕەشەبا و لادانە ژینگەییە ئیکۆلۆژییەکان بوونەتەوە. ئەم خولانەش لەماوەی ملیۆنان ساڵدا چەندین جار دووبارە و چەند بارە بوونەتەوە.

پاشماوەی ڕووەك و دارە ڕۆچووەکانی ناخی زەوی بە تێپەڕبوون و درێژی کات دەگۆڕێن بۆ خەڵوز کەڕەنگی ڕەشە.

# کشتوکاڵ بەڵگەیەکی ماددییە لەسەر زیندووبوونەوە

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾النحل/٦٥، واتـە: هـەر خـوا بـارانی لـە ئاسمانـەوە بارانـدووە و زەوی پـێ زینـدوو کردووەتـەوە دوای ئـەوەی کـە مردبـوو، بەڕاستی ئا لـەو دیاردەیـەدا نیشـانە و بەڵگـەی تـەواو هەیە بۆ کەسانێك کە گوێ بۆ ڕاستی دەگرن.

یـان دەفـەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾فصلت/٣٩، واتە: لە بەڵگە و نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە دەبینیت زەوی کش و ماتـە، جـا کاتێـك بـاران بەسـەریدا دەبارێنێـت دەخرۆشـێت و گەشـە و نەشـونما دەکات، چونکە بەڕاستی ئـەو زاتـەی کـە زەوی زینـدووکردەوە، مـردوانیش زیندوو دەکاتەوە، بێگومان ئەو خوایـە دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو شـتێکدا هەیە.

کشتوکاڵ کردارێکە بەهۆیەوە مـرۆڤ پیشـانی خـۆی دەدات چـۆن خـوای مەزن زەوی لەدوای مردنـی بـە ئـاو زیندوودەکاتـەوە، کاتێـك وشـك و زەرد هەڵگەڕابوو و هەنووکە لێوانلێوانە لـە ژیـان و زینـدەوەران، بـەوجۆرە مـرۆڤ بەچاوی خۆی هەندێك دیاردە و توانای خوا دەبینێت لە بەدیهێنانی ژیان لە زەوی مردووەوە. مرۆڤیش لە خـاکی زەوی بـەدیهێنراوە، وەك پـەروەردگار دەفـــــــــەرموێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ

تَنتَشِرُونَ ﴾الروم/٢٠، واته: له نیشانه و بەڵگەکانی خوا ئەوەیه که ئێوەی له خاك دروستکردووه، دوای بڕینی چەند قۆناغێك کتوپڕ بوونەته مرۆڤێك و بڵاودەبنەوه به زەویدا.

زانستی نوێ بـه شیکاریی جەستـەی مـرۆڤ سەلماندوویەتی کـه لەشـی لەهەمان توخمەکانی خاك پێکهاتووه، لەبەرئەوه ئەو زاتـەی زەوی لـەدوای مردنـی دەژێنێتـەوه، بێگومـان مردووەکـانیش لـەڕۆژی قیامەتـدا زینـدوو دەکاتەوه.

بەمجۆره کشتوکاڵ دەبێته بەڵگەیەکی ماددیی لەسـەر زیندووبوونـەوەی دوای مردن.

## باشترین ڕێگای هەڵگرتنی دانەوێڵه

خوای گەوره له قورئانی پیرۆزدا و له چیرۆکی یوسف پێغەمبەردا (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ ﴿٤٣﴾ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ۖ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ ٱلْأَحْلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِى سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ لَّعَلِّىٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِى سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ

مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾يوسف/٤٣-٤٩.

واتە: (شەوێك پاشا خەوێكی سەیری بینی و بوو بە مەراقی و لە كۆبوونەوەیەكدا) وتی: بەڕاستی من لە خەومدا بینیم حەوت مانگای قەڵەو لەلایەن حەوت مانگای لەڕو لاوازەوە خوران، حەوت گوڵەگەنمی سەوز و جوان و حەوتی وشكیشم بینی، ئەی زانا و شارەزایان ئەم خەوەم بۆ لێكبدەنەوە ئەگەر خەون لێكدەدەنەوە. ئەوانیش وتیان: ئەم خەوە بێ سەر و بنە و هیچ نییە، ئێمە لە لێكدانەوەی خەوی بێسەر و بن شارەزا نین. ئینجا ئەوەیان كە ڕزگاری بووبوو، دوای ئەو هەموو ماوەیە بیری كەوتەوە و وتی: داواكارم بمنێرن (بۆ لای یوسف) من هەواڵی (لێكدانەوەی ئەو خەوەتان) پێڕادەگەیەنم. (ساقی چوو بۆ زیندانەكە بۆ دیدرای یوسف و وتی) یوسف! ئەی هاوەڵی ڕاستكۆم، ئەم خەونەمان بۆ لێكبدەرەوە (لە خەوێكی پادشادا) حەوت مانگای قەڵەو لەلایەن حەوت مانگای لەڕ و لاوازەوە خوران، هەروەها لەبارەی حەوت گوڵەگەنمی سەوز و جوان و حەوتی تری وشك بۆمان لێكبدەرەوە، بۆئەوەی بگەڕێمەوە بۆلای خەڵكی تا وەڵام بزانن. (یوسف) وتی: حەوت ساڵی بەردەوام كشتوكاڵ دەكەن و دانەوێڵە دەچێنن، ئەوەی كە درەوێنەتان كرد و لێتان زیادبوو بە گوڵەكەیەوە بیهێڵنەوە، مەگەر ئەو كەمەی كە دەیخۆن. پاشان لەدوای ئەوە حەوت ساڵ گرانی و سەختی پێشدێت، ئەوەی كە زەخیرەتان كردووە بۆ ئەو ساڵانە هەمووی دەخۆن، مەگەر كەمێكی نەبێت كە هەڵیدەگرن (بۆ تۆو). لەوەودوا ساڵێكی باراناوی و پڕ بەرەكەت دێت كە خەڵكی بەرووبومی زۆریان پێدەبەخشرێت، میوە دەگوشن و شەربەتی لێ دروست دەكەن.

لـەم ئایەتانـەدا بانگـەوازێکی قورئـانی ڕاشـکاوانە هەیـە بـۆ مـرۆڤ تـاکو بەوردی و بەردەوامی و چاودێری تەواوەوە کشتوکاڵ بکات، هـەروەها زیـاد لــە پێویســتیش دەســتەبەر بکــات بــۆ ڕووبەڕووبوونــەوەی بارودۆخــە لەناکاوەکان. ئایەتـە پیرۆزەکـە هـانی مـرۆڤ دەدات بـۆ گرتنەبـەری هـەموو هۆکارەکـانی زانســت بـۆ ئـەمبارکردنی بـەروبووم و بەرهــەمی زیــاد لـە پێویستی، بەجۆرێك کە بەدرێژایی ماوەی هەڵگرتن و پاراستنی لـە حاڵـەتی دروستی و شیاویدا بمێنێتەوە.

ڕووی ئیعجازی ئایەتەکە لەوەدایە کـە دانەوێڵـە بـە گوڵەکەیـەوە ئـەمبار بکرێـت، چـونکە گـەر بــە گوڵەکەیــەوە هــەڵگیرا ئەودەمــە لــە مێـرووە زیانبەخشـەکان و کـەڕووەکان و میکرۆبـەکانی تـر و خەسـاربوون پـارێزراو دەبێت.

زانستی نوێ سەلماندوویەتی باشترین ڕێگای پاراستنی دانەوێڵە ئەوەیـە بە گوڵەکەیەوە هەڵبگیرێت، ئەوەش بە مەبەستی پاراستنی شێی سروشـتی بەروبوومەکە و ڕێگرتن لە کاریگەری ڕاستەوخۆی کەش لەسەر دانەوێڵەکە. بەڕاستی ئەوەش یەکێکە لە ئیعجازەکانی قورئانی پیرۆز کە لەژمارە نایەن.

# ئیعجازی خۆراك لە قورئاندا

ئەو خۆراکانەی مرۆڤ پێویستی پێیانە، ئەمانەن:

١. خۆراکە پێکهێنەرەکان (پرۆتینی ڕووەکی و گیانەوەریی).

٢. خۆراك بۆ وزە (کاربۆهیدرات و چەوری).

٣. خۆراك بۆ پارێزگاری (ڤیتامینەکان و توخمە کانزاییەکان).

چۆن قورئانی پیرۆز باس لە خۆراك و ژێنەرەکان دەکات؟

ڕابمێنـە لـە وتـەی خـوایی: ﴿أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾عـبس/٢٥-٣٢، واتـە: بێگومـان ئێمـە ئاومـان باراندووەتە خوارەوە، چۆن داباریندێك، لەوەودوا زەویمان بۆ لەت لـەت کـرد بە چەکەرەی ناسکی ڕووەك. ئینجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواند. هەروەها ترێ و سەوزە. زەیتون و دارخورمایش. باخچەی دەورەدراو بە دارخورما یان داری تر، یاخود باخی چڕ و پڕ، چەندین جۆر میوە، هـاوڕێ لەگـەڵ هـەموو ئـەو گژوگیایانـەی کـە خـواکردە و مـاڵات دەیخـوات لـە لەوەڕگاکانـدا. (هـەموو ئەمانەمان ئامادە کردووە) تا خۆتان و ماڵاتەکانتان سوودی لێوەربگرن.

ئـەم ئایەتانـە زۆرینـەی ئەوانـە کۆدەکاتـەوە کـە مـرۆڤ دەیـانخوات، پاکوبێگەردی بۆ خوای مەزن.

## یەکەم: ئاو

ئـاو بنـەڕەتی ژیانـە، ڕێـژەی (٥٥-٦٥٪)ی کێشـی لەشـی کەسـێکی پێگەیشتوو پێکدێنێت. ئاو پێویستە بۆ کردارەکانی هەرسکردن، مژین، کرداره کیمیاییەکانی شانەکانی زیندەوەر که پێویسته بۆ ژیان (زیندەکان)، بەهــەمان شــێوە گواســتنەوەی توخمــەکان و پاشمــاوە زیانبــەخش و ژاراوییەکان و دەرکردنی بۆ دەرەوەی لەش بەشێوەی (میـز) یـان ئـارەقی لـەش، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە ئـاو لـە ڕێکخستنی گـەرمی لەشیشدا ڕۆڵ دەبینێت.

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾الأنبياء/٣٠.

## دووەم: دانەوێڵە و پاقلەمەنییەکان

دانەوێڵەکان (وەك گەنم و برنج و گەنمەشامی و جۆداس) بـە سەرچـاوە سەرەکییـەکانی وزە دادەنرێن بۆ مـرۆڤ، دەورووبـەری (٥٥٪)ی ئـەو وزەیـەی مرۆڤ بەدەستیدێنێت سەرچاوەیان کاربۆهێدراتـە کـە پێکهاتـەی سـەرەکی دانەوێڵەکانە، هەروەها بە سەرچاوەیەکی باشـی زۆر لـە ڤیتـامین و توخمـە کانزاییەکان دادەنرێن.

پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿فَادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ مِنْ بَقْلِهَا وَقِثَّائِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا﴾البقــرة/٦١، واتــە: داوا لــە پەروەردگارت بکە لە ڕزق و ڕۆزی و بەروبوومی زەویمان بۆ بەرهەم بهێنێـت لە ڕووەکی پاقلەیی و خەیار و سیر و نیسك و پیاز.

## سێیەم: میوە و سەوزە

میــوە و ســەوزە بایــەخێکی خــۆراکیی گــەورەیان هەیــە، ئەوانــە سەرچــاوەگەلی زۆر باشــن بــۆ ڤیتــامین و توخمــە کانزاییــەکان و ڕیشــاڵە خۆرلکییەکان کە کاریگەریان لەسەر تەندروستی مرۆڤ ڕوون و ئاشکرایە. پــــەروەردگار دەفــــەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعۡرُوشَٰتٍ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍ﴾الأنعام/١٤١، واتە: خوا هەر ئەو زاتەیە کە باخاتی بەرزی لق و پۆپداری بەرپاکردووە و باخاتی نزمی پەرش و بڵاویشی بەدیهێناوە و دارخورما و بەروبوومی جۆراوجۆریش (کە شێوە و قەبارە و ڕەنگ و تام و بۆنیان) لەخواردندا جیایە، لە زەیتون و هەناری لەیەکچوو، هەروەها لەیەکنەچوو.

## چوارەم: گۆشت و ماسی و باڵندەکان

گۆشت و ماسیی لەو خواردنانەن کە بەهایەکی خۆراکیی بەرزیان هەیە، سەرچــاوەی ســەرەکی پرۆتینــی گیانــەوەرین. ئــەم پرۆتینانــە ترشــە ئەمینییەکانیان تێدایە کە مرۆڤ پێویستی پێیانە و لەناو لەشدا بەرهەم نایەن، خوای گەورە زۆر جوانی فەرمووە: ﴿وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۖ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ﴾النحل/٥، واتە: ماڵاتیشی دروستکردووە بۆ خزمەتی ئێوە کە گەرمیتان پێدەبەخشێت، هەروەها سوودی تری

لێوەردەگرن و لە شیر و گۆشتەکەشی دەخۆن لەگەڵ چەندین سوودی تر...

## پێنجەم: شیر و هەنگوین

* شیر سەرچاوەیەکی چاکە بۆ پرۆتین و شەکری لاکتۆز (شەکری شیر) و زۆرێك لە ڤیتامینەکان و توخمە خۆراکییە کانزاییەکان (گرنگترینیان کالیسیۆم)... پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾البقرة/٢٣٣، واتە: دایکان دوو ساڵی تەواو با شیر بە منداڵەکانیان بدەن بۆ هەر کەس کە دەیەوێت شیری تەواو بدات.

لەڕووی زانستییەوە سەلمێنراوە کە هیچ شیرێك یان خواردنێکی تر هاوتای شیری دایك نابێت.

* هەنگوین سەرچاوەیەکی باشە بۆ شەکرە سادەکان، گلوکۆزیش تاکە سەرچاوەیەکی وزەیە کە مێشك پێویستیەتی.

هەروەها هەنگوین هەندێك لە توخمە کانزاییەکانی تێدایە لەگەڵ هەندێك لە دژە زیندەگییەکان (المضادات الحيوية) و ئاوێتەی تریش.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ﴾النحل/٦٩، واتە: لەناو سکی (ئەو هەنگانەوە) شلەیەکی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە کە شیفای تێدایە بۆ (زۆر نەخۆشی) خەڵکی.

# سەرەتا لەسەر زەوی ئاو هەبووە پاشان ڕووەك

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا﴾عبس/٢٥-٢٧، واتە: بێگومان ئێمە ئاومان باراندووەتە خوارەوە، چۆن داباریینێك، لەوەودوا زەویمان بۆ لەت لەت کرد بە چەکەرەی ناسکی ڕووەك. ئینجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواند.

ئەم ئایەتانە ئاماژە بەوە دەدەن کە لەسەرەتای بەدیهێنانەوە لەسەر زەوی ئاو دەرکەوتووە، لەدوای ئەوە ڕووەك و لە پاشان مرۆڤ بەدیهێنراوە.

زانایانی فەلەك دەڵێن: زەوی بەر لە ملیۆنان ساڵ پێکهاتووە لەدوای جیابوونەوەی لە خۆر، سەرەتا بەشێوەی گازێکی کڵپەسەندوو بووە و پاشان بەهۆی خولانەوەی ئەم بارستە گازییە بەدەوری خۆیدا (لە بۆشایی دەرەوە)، شێوەی گۆیی وەرگرتووە، پاشان بەهۆی دوورکەوتنەوەی ئەم بارستەیە لە خۆر گازەکان ساردبوونەتەوە و ئەوەش هۆکاری پێکهاتنی ڕووی دەرەوەی بووە کە بە پلەبەندی ڕەقهەڵاتووە. بەوپێیەش کە گازەکان لە ئۆکسجین و هایدرۆجین پێکهاتوون و هەر ئەو دوانەش تۆخمی پێکهێنەری ئاون، لەبەرئەوە لەنێو ئەم بارستە گازییەدا ئاو دروستبوو، پاشان بەهەڵمبوو و بەرزبووەوە و ساردبووەوە، دووبارە بەشێوەی لێزمەباران بۆی گەڕاوەتەوە و داباریوەتە سەری، بەمجۆرە سەرەتا زەوی دروستبووە و پاشان ئاوی لێ دەرچووە و لەدوای ئەوە ڕووەك دروستبووە.

# ١) گەزۆ (الأثل)

(أثـل) لـەو دارانەیـە كـە گـەزۆی بـۆ سـەر دادەبارێـت، لـە باخچـە و سەیرانگاكاندا دەڕوێنرێت. توانای بەرگەگرتنی سوێرێتی خاك و تینـوێتی هەیە، هەر بۆیە لە ناوچە وشك یان خوێدارەكانی جیهانـدا بـلاوە. لەلایـەكی ترەوە وەك بەربەستی (با) دەڕوێنرێت بەتایبەت لە زەوییە لمینەكاندا.

تەختـەی داری دارگـەزۆ لـە دروسـتكردنی كەلوپـەلی ماڵـدا بـەكاردێت، وتـراوە كـە مینبەرەكـەی پێغەمبـەر (ﷺ) لـە مەدینـە لـە دارگـەزۆی ئـەو دارستانە دروستكراوە كە نـۆ میـل لـە مەدینـەوە دوورە. بە بـەری دارگـەزۆ پێستە خۆشە دەكرێت و مەرەكـەبی نوسـینی لێ دروسـتكراوە. لـەك كۆنیشـدا لـە پزیشـكی میللیدا بەكارهاتووە.



## دارگەزۆ (أثل) لەقورئانی پیرۆزدا

(أثل) یەكجار لە قورئاندا ئاماژەی پێدراوە لە چیرۆكی سەبەئدا. زۆر لـە توێـژەران وادەبیـنن كـە فـەرمانڕەوایی (سـبأ) (٩٥٠-١١٥پ.ز) دێـرینترین فەرمانڕەواییـە كـە باشـوری خۆرهـەڵاتی نیوەدورگـەی عـەرەبی بەخۆیـەوە

بینیـوە، خـەڵکی (سـبأ) کشـتوکاڵیان زانیـوە و ئـەوەش یارمـەتی داون بۆئەوەی ژیانێکی سەقامگیر بژین، وای لێکردوون هـەنگاوی گـەورە بـەرەو پێشکەوتن و شارستانییەت بنێن.

سـەبەئییەکان لەسـەرەتادا (صَرْواح)یـان کردبـووە پایتـەختی خۆیان، پاشـان زۆری نەخایانـد پایتەختەکـەیانیان بـۆ (مـەئرەب) گواسـتەوە، (مەئرەب) بووە ناوەندێکی بازرگانی گرنگ. شارسـتانییەتی سـەبەئییەکان پشتی بە بازرگانی کاروانە وشکانییەکان دەبەست کە کەلوپەل و کاڵایان لە (حەزرەمەوت) لـە خۆرهەڵاتـەوە بۆ (مـەئرەب) لـە خۆرئـاوا دەگواستەوە. لێرەدا کاروانییەکان بەرەو باکور بۆ ناوچە نزیکەکان لە دەریـای ناوەڕاست و جگە لەوانەش دەڕۆیشتن. (سـبأ) پـەیوەندیگـەلی بـەهێزی دروستکردبوو لـەنێوان نیوەدورگـەی عـەرەبی و میسـر و وڵاتـی نێـوان دوو ڕووبـارە (میزۆپۆتامیا) و فارسدا.

(سبأ) لەنێو نەتەوە دێرینەکاندا ناوبانگی هەیە، لە تەوراتـدا باسیکراوە بـەوەی وڵاتێکـە خشـت و بـەردی پـیرۆز (گەوهـەر) و کـانزای زێـڕ بەرهـەم دێنێت. قورئانی پیرۆزیش لە زیاد لـە جێگایەکدا باسـی چیرۆکی سـەبەئی کردووە، باسی ئەو بەخشش و نیعمەتانەی کردووە کە هەیانبووە و وڵاتێکی بـەپیت و خـۆش و ئـاوەدان بـووە... قورئـانی پـیرۆز ئاماژە بـە بەنـداوی (مەئرەب) دەدات کە بەڵقیس پادشایان دروستیکرد، ڕوونی کردووەتەوە کە ئەهلی (سبأ) سوپاسگوزار نەبوون و سەرپێچییان کردووە، بێباوەڕ بـوون و لەبری خوا خۆریان پەرستووە.

پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾

فَأَعۡرَضُواْ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ وَبَدَّلۡنَٰهُم بِجَنَّتَيۡهِمۡ جَنَّتَيۡنِ ذَوَاتَىۡ أُكُلٍ خَمۡطٖ وَأَثۡلٖ وَشَيۡءٖ مِّن سِدۡرٖ قَلِيلٖ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِمَا كَفَرُواْۖ وَهَلۡ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلۡكَفُورَ﴾سبأ/١٥-١٧، واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی بۆ خەڵکی (سبأ) لە ولاّتی خۆیاندا بەڵگە و نیشانەی دەسەلاّتی خوا ئاشکرایە، ئەویش دوو باخی زۆر گەورە بوو لەلای ڕاست و چەپی ناوچەکەدا، فەرمانیان پێدرابوو کە: بخۆن لە ڕزق و ڕۆزی پەروەردگارتان و سوپاسگوزاری بن، ولاّتێکی خۆش و ئاوەدان، پەروەردگارێکی لێخۆشبوو و لێبوردە... جا ئەوان لەجیاتی شوکرانەبژێر بن و خواپەرستی بکەن پشتیان هەڵکرد و بەدەم بانگەوازی خواوە نەچوون، بەهۆی ئەوەوە ئێمەش لافاوێکی وێرانکەرمان بەسەردا بەرەلاّ کردن، (باخ و بێستانی کاول کردن) ئەوسا لەجیاتی ئەو دوو باخە گەورەیە دوو باخی دڕکاوی بەروبووم تاڵ و داری بێبەری وەك دارگەزۆ و کەمێك داری (سدر) یش کە بەروبوومێکی کەمی هەیە، پێمان بەخشین. ئا بەوجۆرە سەختە تۆڵەمان لێسەندن بەهۆی ئەوەوە کە بێباوەڕ و سپڵەبوون، ئایا ئێمە تۆڵە هەر لە کافر و سپڵە ناسێنین؟!

ڕاڤەکارانی قورئان دەربارەی وتەی پەروەردگار: ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ﴾ دەڵێن: ﴿سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ﴾ ئەو لافاوە بەخوڕەیە کە خوای گەورە بۆ سەر سەبەئی نارد. وتراوە: ﴿ٱلۡعَرِمِ﴾ ناوی دۆڵەکەیە، یان: ناوێکە و بریتییە لەو بەربەستەی ئاو گلدەداتەوە.

ئایەتە پیرۆزەکان ڕوونیان کردووەتەوە کە خوای پەروەردگار ولاّتی سەبەئی کردووەتە ولاّتێکی خۆش و ئاوەدان، لەبەر باشی و سازگاری ئاووهەواکەی و دەستکەوتنی ڕۆزییەکی باش و شیاو، باخ و بێستانەکان

لەسەر هەردوولای دۆڵەکە بەروبوومی خۆشی هەمەجۆر و هەمە ڕەنگیان دەدا، ئەوان لێیان دەخوارد و چێژیان لە بەروبووم و خۆشی وڵاتەکەیان وەردەگرت، تەنانەت وتراوە: کاتێك ئافرەت بە سەبەتەی سەر شانیەوە بەژێر دارەکانـدا دەڕۆیشـت، لەبەر زۆریی و پێگەیشـتنی دارەکـان سەبەتەکەی سەر سەریان پڕ لە بەروبووم دەبوو.

خەڵکی (سبأ) پشتیان لەو زاتە کرد کە پێیبەخشیبوون و لە وڵاتدا ستەمکارییان کرد، بۆیە شایانی سزا و بەڵا بوون. خوای گەورە جرجی بۆ بەنداوەکەیان نارد و خوارەوەی بەنداوەکە لاواز بوو، پاشان لافاوی بەخوڕی بۆ ناردن بەنداوەکەی تێکشکاند و وێرانی کرد، لەگەڵ خۆیدا بەردی هەڵگرت تا ئەو بێستانانە خاپور بکات کە دەکەوتنە سەر لاکانی دۆڵەکە، ئەو دارە بەردارانە بوونە داری دڕکاوی و دارگەزۆ و (سِدر)ی خراپ. لەدوای ئاوەدانی بووە وێرانە.

لە ئایەتە پیرۆزەکانەوە بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێت سوپاسگوزار نەبوون هۆی گۆڕانی ئەو بەخششانەیە کە بە خەڵکی (سبأ) درابوو.

## (٢) پیاز (البصل)

پیاز لای میسرییە کۆنەکان ناسراوە و هەموو تاکەکانی گەل دەیخۆن جگە لە ڕاهیبەکان، ئەوان لەسەریان حەرام کرابوو. وەك نزیکبوونەوە لە خواوەندەکان پێشکەش دەکرا، دەڵێن: فیرعەونەکان پیازیان پیرۆزکردووە، بەڵکو سوێندیان پێخواردووە.

لەڕووی كشتیارییەوە زۆربەی جۆرەكانی پیاز بۆ تەواوكردنی خولی ژیانیان پێویستیان بە دوو ساڵ هەیە. پیاز بە فسقە یان تۆو دەڕوێنرێت. پێویستی بە خاكێكی لاواز و دەوڵەمەند و بڕی زۆری ئاو هەیە، بەتایبەتی كە هێشتا بچووكە.

پیاز ئاوێتەی گۆگردیی تێدایە كە تام و بۆنەكەی پێدەبەخشێت. پیازەكان لەهێزی تامیاندا جیاوازن. خەڵك پیازی گۆیی زەردی تام توند لە دروستكردنی شۆربا (چێشت)دا بەكاردێنن، بەڵام پیازی ئیسپانی شیرین زۆرجار بە كاڵی لە زەڵاتەدا بەكاردێت، بەگشتی پیاز بە كاڵی و بەكوڵاوی دەخورێت.



بوونی پیاز لە ژەمەكاندا هانی دەردانی شلەمەنییە هەرسكارەكان دەدات و هەرسكردن ئاسان دەكات. میسر پیازی برژاو (مشوي) دەخۆن كە جەستە بەهێز دەكات و ڕووخسار سوور هەڵدەگەڕێنێت و ماسولكەكان توند و بەهێز دەكات. دەكرێت پیاز لە چارەسەری برینەكاندا بەكاربهێنرێت. توێژینەوە نوێیەكان سەلماندوویانە پیاز لە پێشەوەی ئەو ڕووەكانەیە كە میكرۆبەكان دەكوژێت.

## پیاز (البصل) لە قورئانی پیرۆزدا

خوای گەورە یەك جار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بە پیاز داوە لە سورەتی (البقرة)دا و لە میانەی چیرۆكی (بنو ئیسرائیل)دا.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ﴾البقرة/٦١، واتە: یادی ئەو نیعمەتە بكەنەوە كاتێك بە (موسا)تان وت: ئێمە هەرگیز لەسەر یەك جۆر خۆراك ئۆقرە ناگرین و بە تەنها جۆرێك خواردەمەنی ڕازی نین، لەبەرئەوە داوا لە پەروەردگارت بكە لە ڕزق و ڕۆزیی و بەروبوومی زەویمان بۆ بەرهەم بهێنێت لە ڕووەكی پاقلەیی و خەیار و سیر و نیسك و پیاز، موسا پێیوتن: باشە چۆن ئێوە شتی كەم و ناتەواو وەردەگرن لەجیاتی شتی لەو چاكتر و باشتر؟ دە دابەزن بۆ شارێك (بیابانی سینا بەجێ بهێڵن) ئینجا بەڕاستی ئەوەی داوای دەكەن دەستتان دەكەوێت. (جا بەهۆی ئەو بیروباوەڕ و بیانوگرتن و لاساریییانەوە) سوكی و ڕیسوایی و لاتی و زەبوونی درا بەسەریاندا و شایانی خەشم و قینی خوایش بوون، چونكە ئەوان بەڕاستی باوەڕیان بە ئایەتەكانی خوا نەدەكرد و بە ناهەق پێغەمبەرەكانیان

دەکوشت، ئەوەش بەهۆی ڕۆچوونیانەوە لە یاخیبوون و نافەرمانیدا، هەمیشە دەستدرێژیان دەکرد.

لەگەڵ ڕووەکەکانی تردا پیاز لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتووە، بەڵام ڕووەکی پاقلەیی کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، وتراوە: دار نییە. وتراوە: ئەو ڕووەکەیە کە لە زستاندا دەڕوێت.

فەرموودەی خوایی لەسەر زمانی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێ):

﴿قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ﴾ نکوڵیکردنی داواکەیانە، ئەوان داوای خۆراکێك دەکەن پێویستی بە کاری گران هەیە لە کشتوکاڵ و ئاودێری و کۆکردنەوە، لەجیاتی خواردنێك کە ناڕەحەتی و تێچوونی نییە، ئەویش گەزۆ و باڵندەی شەلاقە (المن و السلوى)یە کە بۆیان دادەبەزێت. ئایا ئاقڵێك هەیە پیاز پێشبخات بەسەر گەزۆ و باڵندەی شەلاقەدا؟! لەکاتێکدا کە سەرچاوەن بۆ پرۆتین و شەکرە سادەکان و ئاڵۆزەکان و وزەبەخشن، مەسەلەکە لەوە دەرناچێت کە کەللەڕەقی و ڕازی نەبوونە لە (بنو إسرائيل)ەوە و هیچی تر.

ئەگەر بەدیدێکی زانستی ڕەهاوە بڕوانینە فەرموودەی پەروەردگار: ﴿قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ﴾ دەبینین پاقلەمەنی و پیاز پرۆتینی ڕووەکین، بەڵام باڵندەی شەلاقە (سلوى) پرۆتینی ئاژەڵییە. زانستی نوێ سەلماندوویەتی پرۆتینی ئاژەڵی کە لە باڵندەکەدا هەیە زۆر باشترە لە پرۆتینی ڕووەکی. هەروەها توێژینەوە زانستییەکان دەڵێن پرۆتینی ڕووەکی لەکاتی گۆڕینیدا بۆ وزە جەستە شەکەت دەکات بەپێچەوانەی پرۆتینی ئاژەڵییەوە، ئەوەیە فەرموودەکەی پەروەردگار ئاماژەی پێدەدات و دەفەرموێت: ﴿باشە چۆن ئێوە شتی کەم و ناتەواو

وەردەگرن لەجیاتی شتی لەو چاکتر و باشتر﴾. کەمی و ناتەواوییەکە لە دوو ڕووەوەیە، یەکەمیان: پرۆتینی ڕووەکی هەموو ترشە ئەمینییەکانی تێدا نییە، دووەمیان: ڕێژەی سەدی ئەو ترشە ئەمینییانە کەمترە بە بەراورد لەگەڵ ترشە ئەمینییەکان لە پرۆتینی ئاژەڵیدا. ئەمەش بە پێشینەیەکی زانستیی قورئانی پیرۆز دادەنرێت. خوا بە نیاز و مەبەستی زاناترە.

## ( ٢ ) هەنجیر ( التین )

هەنجیر میوەیەکە زیاتر لە چوار هەزار ساڵە دەڕوێنرێت، پێدەچێت بنەڕەتەکەی بگەڕێتەوە بۆ باشوری خۆرئاوای ئاسیا، لەپاشان بڵاوبووەوە تا گەیشتە ناوچەی دەریای ناوەڕاست. بەڵگەنامەی دێرینی یۆنانی و ڕۆمانی و میسری هەن وەسفی بەرەوی هەنجیر دەکەن وەك خۆراك، تا هەنووکەش نەخشە و هێلکاری هەنجیر لەسەر دیواری پەرستگاکانی فیرعەونەکان ماوەتەوە.




زۆربەی دارەکانی هەنجیر بەرزییەکانیان کەمترە لە دە مەتر، تێکڕای چێوەی قەدەکەی دەگاتە یەك مەتر. ڕەنگی توێکڵی هەنجیر جیاوازە: سەوزە یان زەرد، پەمەیی، ئەرخەوانی، قاوەیی یاخود ڕەشە. دارەکانی

هەنجیر ساڵانە دوو یان سێ جار بەرهەم دەدەن. هەنجیر بەڕێگای قەڵەم (عقل) یان ڕاکشان (الترقید) (لقەکەی بکرێت بەژێر گڵەوە) یان موتوربەکردن زیاددەکات، لە ئاووهەوای گەرم و وشکی هاوین و سارد و شێداری زستانیشدا گەشە دەکات.

بەرهەمی هەنجیر ڕێژەیەکی بەرز شەکری تێدایە، بە پێگەیشتویی، یا وشککراوە یا لە قوتونراو یاخود پارێزراو لەشەکردا دەخورێت. هەنجیر دەچێتە پێکهاتەی زۆر لە ڕەچەتەی پزیشکی میللی بەکارهێنراو لە زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکان و لە چارەسەری گەلێك نەخۆشیدا بەکاردێت.

## هەنجیر (التین) لە قورئانی پیرۆزدا

خوای گەورە یەك جار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بە هەنجیر داوە، ئەویش لە دەستپێکی سورەتی (التین)دا کە سوێندی پێخواردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ﴾التين/١، واتە: سوێند بە هەنجیر و زەیتون.

بۆچوونی ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز جیاوازە لە ڕاڤەی مانای ﴿وَٱلتِّينِ﴾. "ئیبن عەباس" وتویەتی: "ئەوە ئەم هەنجیر و زەیتونەیە کە دەیخۆین". "إمام طبري" وتویەتی: "خوا سوێندی بەو هەنجیرە خواردووە کە دەخورێت و ئەو زەیتونەی دەگوشرێت". زۆربەی ڕاڤەکاران بەمجۆرە باسی دەکەن.

هەندێك لە ڕاڤەکارانیش وادەبینن ئەم ڕاڤەیە ناگونجێت ئەگەر دوو ئایەتەکەی دواتریشی لەگەڵدا لێکبدرێتەوە کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَطُورِ سِينِينَ ۝٢ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ﴾التين/٢-٣، واتە: سوێند بە کێوی طوری سینا، سوێند بەم شارە ئارامە (کە مەککەیە).

هەندێك لە زانایان ڕایان وایە ناگونجێت (التین و الزیتون) مانای هەنجیر و زەیتون بدەن، ئەوان دەڵێن: باسی دوو شتی خوراو کراوە (هەنجیر و زەیتون) لەگەڵ دوو جێگا (طوری سینا، و ئەم وڵاتە ئارامە). وەك پێداگری لەسەر ئەوە دەوترێت: خوای پەروەردگار لە ئایەتە پیرۆزەکاندا سوێندی بەو جێگا پیرۆزانە خواردووە کە خۆی ڕێزداری کردوون بە نیگا و پەیامە ئاسمانییەکان. وتراوە: مەبەست لە (التین) چیای (تین)ـە کە باوکی پێغەمبەران ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) لەسەری دەرکەوتووە، (زیتون)یش چیای (زیتون)ە کە عیسا پێغەمبەری (سەلامی خوای لێبێت) لێ دەرکەوتووە و هەردووکیان لە دەوری (بیت المقدس)ن. (طوری سینا)ش ئەو جێگایەیە کە موسای لێ دەرکەوت (سەلامی خوای لێبێت)، بەڵام (البلد الأمین) مەککەیە کە محمدی (ﷺ) لێ دەرکەوت.

وتراوە: (التین) لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئاماژەیە بۆ کێوی (تینا) لە تەنیشت دیمەشق. (تینا) چیایەکە لەنێوان حەلوان و هەمەدان. وتراوە: مەبەست لە (تین) لە ئایەتە پیرۆزەکەدا مزگەوتی یارانی ئەشکەوتە، یان: مزگەوتی نوحە کە لەسەر چیای جودییە، یان مزگەوتی (بیت المقدس).

هەندێك لە ڕاڤەکاران بۆ ئەوە چوون مەبەست لە (تین) لە ئایەتە پیرۆزەکەدا داری هەنجیرە کە ئادەم و حەوا لە بەهەشتدا بە گەڵاکانی خۆیان داپۆشی دوای ئەوەی لەو دارەیان خوارد کە خوای پەروەردگار لەسەریانی قەدەغە کردبوو. خوای گەورە بە نیاز و مەبەستی زاناترە.

## (٤) خەرتەلە (الخردل)

خەرتەلە ڕووەکێکی وەرزییە و لە ناوچە ئاوومەوا مام ناوەندەکاندا دەڕوێت، گەڵاکانی هەمیشە سەوز و ئەستورن و بەجۆرێك قلّیشاون. دەکرێت گەڵاکانی بە نەرمونیانی و گەشاوەیی لێبکرێتەوە و وەك سەوزەکانی تر بخورێت. دیارترین جۆرەکانی خەرتەلە، خەرتەلەی ڕەشە کە لە تۆوە وردەکانیەوە دەردەهێنرێت. هەروەها لەتۆوەکانی خەرتەلەی سپی زەیتێکی تون دەردەهێنرێت و لە پیشەسازی سابوون دروستکردندا بەکاردێت، لەکۆندا بۆ ڕووناککردنەوە بەکارهاتووە.



خواردنی خەرتەلە بە مامناوەندی مەیلی خواردن باش دەکات و یارمەتی هەرسکردن دەدات و گازەکان لە ڕیخۆڵەکان وەدەردەنێت. خەڵك هاڕاوەی دەرهێنراو لە تۆو خەرتەلە بۆ ڕازاندنەوەی زەڵاتە بەکاردێنێت. خەرتەلە لە ئامادەکردنی سرکەدا بەکاردێت و وەك بەهاراتیش دەکرێت بە گۆشت و ماسییەوە.

خەرتەلە پێگەیەکی نایابی لە پزیشکی میللیدا هەیە، بۆ نەخۆشییەکانی سپڵ سوودمەندە... وتراوە: ئەگەر بخرێتە سەر سەرێك کە بە گوێزان

تاشرابێت سوودی پێدەگەیەنێت لە لەبیرچوونەوە و کەمبوونەوەی توانای لەبەرکردن. ئەگەر چاوی پێ بڕێژرێت لێڵی چاو نامێڵێت.

## خەرتەلە (الخردل) لە قورئانی پیرۆزدا

وشەی (خەردل) دوو جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە لە میانەی قسەکردن دەربارەی دادپەروەری ڕەها و زانستی فراوانی پەروەردگار، وەك دەفەرموێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ الانبیاء/٤٧، واتە: ئێمە پێوەر و تەرازووەکانی دادپەروەری لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، جا هیچ کەس بەهیچ شێوەیەك ستەمی لێناکرێت، ئەگەر بەقەدەر تۆوە خەرتەلەیەك (کە زۆر بچووك و وردە، کارێکی چاك یان خراپی ئەنجامدابێت) دەیهێنینە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە ئاوا بە وردی حساب و لێپرسینەوە ئەنجام بدەین.

ئایەتە پیرۆزەکە دەربارەی دادپەروەری ڕەهای خوایی دەدوێت، دادپەروەری کردن لەنێوان بەندەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا، دیمەنێك لە دیمەنەکانی ڕۆژی قیامەتمان بۆ وێنا دەکات کە خوای پەروەردگار تەرازووەکانی دادپەروەری بۆ مرۆڤ دادەنێت و کەس ستەمی لێناکرێت ئەگەر هێندەی تۆوە خەرتەلەیەکیش بێت، کە بچوکترە لەوەی چاو بیبینێت و زۆر سوکیشە لەسەر تەرازوو، ئەم شتە سادەیەش لە ڕۆژی قیامەتدا بەجێ ناهێڵرێت و وننابێت... پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا

يَـرَهُۥ﴾الزلزلة/٧-٨، واتـە: ئـەوەی هێنـدەی سـەنگی گەردیلەیـەك خێـر و چـاکەی ئەنجامـدابێت دەیبینێتـەوە، ئـەوەش کـە هێنـدەی سـەنگی گەردیلەیەك شەڕ و خراپەی هەبێت دەیبینێتەوە.

لە گوزارشتێکی خوایی موعجیزەئاسادا قورئانی پـیرۆز وەسفی زانستی خوا و گشتگیری و توانا و دادپەروەریی دەکات. خوای پـەروەردگار لەسـەر زمانی لوقمانی دانا کە ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات، دەفـەرموێت: ﴿ يَـٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴾لقمـان/١٦، واتـە: ئـەی کـوڕی ئـازیزم! بەڕاسـتی ئەگەر گوناهێك هێنـدەی تـۆو خەرتەلەیـەك (کـە زۆر وردە) هـەبێت و لـەناو بەردێکدا لە ئاسمانەکان یان لە زەویدا حەشـار درابێـت، (لای خـوا شـاراوە نییە) و دەیهێنێتە مەیدان، چونکە بەڕاسـتی خـوا هـیچ شـتێکی لێ شـاراوە نییە و زۆریش بە ئاگایە.

ئایەتە پیرۆزەکە باسی تۆو خەرتەلەیەك دەکات لە بەردی پتەودا، تیایدا گیرە، دەرناکەوێت و کەس پێیناگـات، یـان ئـەو دەنکـە تـۆوە لـە ئاسمانـە فراوانەکاندایـە کـە تیایـدا گەلەسـتێرەیەکی گـەورە وەك خـاڵێکی بچـوك دەردەکەوێت، یان ئەو تۆوە لە زەویدا و لە خاکەکەیدا ونبووە و لای کـەس ئاشکرا نییە. ئـەو دەنکـە تـۆوە هەرچۆن بێـت و لەهـەر کـوێ بێـت خـوای گەورە دەزانێت و بە توانا و میهرەبانی خۆی شوێنی دەکەوێت.

## ( ٥ ) هەنار ( الرّمان )

داری هەنار بە خوارڕسكانە لە خۆرئاوای ئاسیا و باكوری خۆرئاوای هیند دەڕوێـت، كـە خوارڕسـكانە پێـدەگات ڕووەكێكـی گیاییـە، بـەڵام كـە بەشێوەیەكی دەستكرد دەڕوێنرێت وەك دارێكی بچوك (دەوەن) پێدەگات، كە بەرزییەكەی دەگاتە چوار بۆ شەش مەتر.



هـەنار بەگشـتی پایەیەكی دیاری لـە پزیشـكی میللیـدا هەیـە، بەتایبـەت هـەناری شـیرین، بەسـوودە بـۆ ئازارەكانی گەدە و گورچیلە و سنگ و سكچـوونیش دەوەسـتێنێت. هەناری ترش ئەگەر ئاوەكـەی بخورێتەوە بەسوودە بۆ هەوكردنی گەدە و ڕشانەوە دەوەستێنێت، ئەگـەر دەنكەكانی بكوترێت و بكرێت بەسـەر برینـدا سارێژی دەكات، خۆئەگـەر بسوتێنرێت و ئەو كارەی پێبكرێت ئەوە باشترە.

## هەنار (الرمان) لە قورئانی پیرۆزدا

لە قورئانی پیرۆزدا سێ جار باسی هەنار هاتووە، دوو جاریان ناسراوە بە (أل) (واتە بە موعەرڕەفی هاتووە)، ئەوەش لە میانەی بیرخستنەوەی خەڵکی بەو بەخششانەی لە دونیادا پێیان دراوە، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾الأنعام/٩٩، واتە: ئەو خوایە زاتێکە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت (دەفەرموێت): جا بەهۆیەوە چرۆ و چەکەرەی هەموو شتێکی پێدەردێنین و شینی دەکەین، ئینجا لاسکی سەوزی لێ پەیدا دەکەین. زنجیرە دانەی سەفتەکراوی لێ دروست دەکەین (وەك گوڵە گەنم و چەڵتوك و گەنمەشامی و...هتد) لە دارخورماش لەهەندێك لق و چڵەپۆپەی هێشووی خورما شۆڕدەبێتەوە، هەروەها باخی هەمەجۆری ڕەز و تریێ، زەیتون و هەناریش، هەیانە لە ڕواڵەتدا لەیەك دەچێت، هەشیانە لەیەك ناچێت، جا تەماشای بەرەکەی بکەن کاتێك بەردەگرێت، پێدەگات، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا (کە ئاماژەی تێدا کرا بۆتان) چەندین بەڵگە و نیشانەی تەواو هەن بۆ کەسانێك کە باوەڕ دەهێنن.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٖ مَّعۡرُوشَٰتٖ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهٗا

وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍۚ كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾الأنعام/١٤١، واتـه: خـوا هـەر ئـەو زاتەیـە کـە باخـاتی بـەرزی لـق و پۆپـداری بـەرپاکردووە و باخـاتی نزمـی پـەرش و بڵاویشی بەدیهێناوە و دارخورما و بەروبوومی جۆراوجۆریش کە شێوە و قەبارە و ڕەنگ و تام و بۆنیان لە خواردنـدا جیایە، لـە زەیتـون و هـەناری لەیەکچوو، هەروەها لەیەکنەچوو، بخۆن لە بەروبوومەکەی کاتێك دەیگرێـت و ڕۆژی چـنین و دروێنـە مـافی (هـەژارانی) لێبـدەن و زیـادەڕەوی مەکـەن، چونکە خوا لەسنوور دەرچوان و زیادەڕەوانی خۆشناوێت.

لـەم دوو ئایەتـە پـیرۆزەدا تێبینـی دەکرێـت کـە خـوای پـەروەردگار جۆرگەلێکی ڕووەکی باسکردووە، هاوبەشـەکانیان بـریتین لـە: دارخورما و زەیتـون و هـەنارە، لـە هـەردوو ئایەتەکەشـدا هـەنار لـەپێش زەیتونـەوە هاتووە.

له دوو ئایەتە پیرۆزەکەوە دەردەکەوێت کە مەبەستی بـەدیهێنانی ئـەم ڕووەکانە لەلایەن پەروەردگارەوە سوود لێوەرگرتنیانـە لەلایـەن مرۆڤـەوە، بەر لەوەش بۆ تەماشاکردن و دیتنی توانای بەدیهێنـەرە لەگـەڵ بەخشـینی بێسنووری ئەو زاتە.

له قورئانی پیرۆزدا یەکجار وشەی هەنار (رمان) هـاتووە بـەبێ ئـامرازی ناسین (أداة التعريف)، ئەوەش لە میانەی مژدەدانی پەروەردگارە بە بەندە دڵسۆزەکانی بە هەندێك لەو بەخششانەی لە بەهەشتدا بۆیان ئامادە کراوە. پـــەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾ فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾

﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾الرحمن/٦٢-٦٩، واتە: جگە لەو دوو بەهەشتە، دوو بەهەشتی تریش ئامادەیە بۆ ئەوانەی پلە و پایەیان وا لەخوار خاوەنانی دوو بەهەشتی ناوبراوەوە. جا ئیتر ئەی مرۆڤ و پەری، بە کام لە ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن، کامەی پەسەند ناکەن. (ئەو بەهەشتانەش) ئەوەندە سەوز دەنوێنن مەیلە و ڕەش دەچنەوە لە جوانی و تۆخیدا. جا ئیتر ئەی مرۆڤ و پەری بە کام لە ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن، کامەی پەسەند ناکەن. دوو سەرچاوەی هەڵقوڵاویان تێدایە. جا ئیتر ئەی مرۆڤ و پەری، بە کام لە ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن، کامەی پەسەند ناکەن. داری میوە و دارخورما و هەناریان تێدایە. جا ئیتر ئەی مرۆڤ و پەری، بە کام لە ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن، کامەی پەسەند ناکەن.

لەو ئایەتە پیرۆزانەوە دەردەکەوێت کە هەنار یەکێکە لەو بەخششانەی خوای گەورە لە بەهەشتدا بۆ بەندە باوەڕدارەکانی ئامادە کردووە.

خوێنەری وردەکار لە قورئانی پیرۆز لە فەرموودەی پەروەردگارەوە ﴿فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ﴾ تێبینی دەکات کە خوای گەورە باسی میوەی کردووە ئینجا باسی دارخورما و هەنار... لێرەدا هەندێك لە ڕاڤەکاران پرسیار دەکەن: ئایا هەنار و خورما میوەن یان نا؟ هەندێکیان وتویانە: هەنار و خورما میوە نین وەك لە ئایەتەکەوە وەردەگیرێت. لای "أبي حنيفة" هەنار و خورما میوە نین. هەندێکی تریان وتویانە: خورما و هەنار میوەن. ڕەنگە بوترێت: ئەگەر ئەوانیش هەر میوەن ئیتر بۆچی لە ئایەتەکەدا میوە جیاکراوەتەوە لە خورما و هەنار؟! لەم بارەیەوە "الفراء" دەڵێت: ئەمە وەك ئەو فەرموودەیەی پەروەردگارە کە دەفەرموێت:

﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾البقرة/٢٣٨، واتە: كەمتەرخەمی مەكەن و پارێزگاری لە ئەنجامدانی نوێژەكاندا بكەن، بەتایبەتی نوێژی ناوەند (كە نوێژی عەسرە) هەمیشە و بەردەوامیش فەرمانەكان بۆ خوا ئەنجام بدەن، بەگەردن كەچییەوە.

لە ئایەتەكەدا خوای پەروەردگار فەرمانی پارێزگاریكردنی سەرجەم نوێژەكانی داوە، لەپاشان دەگەڕێتەوە بۆ (وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ) وەك جەخت لەسەر كردنەوەی. بەهەمان شێوە دووبارە باسی خورما و هەنار كراوەتەوە وەك هاندانێكی بەهەشتییەكان. ئیتر خوای گەورە زاناترە.

## (٦) ڕێحانە (الريحان)

هەر لە كۆنەوە ڕێحانە ناسراوە، لەلای پێشینەكانی یۆنان بەهایەكی زۆری هەبووە و لە ئاهەنگەكانیاندا بەكاریانهێناوە، تا هەنووكە لقەكانی ڕێحانە لە هەندێك وڵاتدا بۆ ڕازاندنەوەی گۆڕی مردووەكانیان بەكاریدێنن، بەڵكو هەندێجار گەڵا وشكەكانیان لەگەڵ مردوودا خستووەتە گۆڕەوە.

ڕێحانە گیایەكی تەمەن درێژە (زیاتر لە ٢ ساڵ). بەرگەی جۆری جیاوازی خاك دەگرێت ، هەروەها بەرگەی وشكی و بێئاویش دەگرێت.

ڕێحانە لەو ڕووەكانەیە كە هەمیشە سەوزە، درێژی قەدەكەی دەگاتە (٣٠ سانتیمەتر)، ئەگەرچی جۆرێك لە ڕێحانە هەیە وەك دەوەن گەشەدەكات و درێژیی دەگاتە زیاد لە دوو مەتر. گەڵاكانی بریقەدار و سەوزێكی تۆخە، گوڵەكانی سپی و بۆنخۆشن.

گەڵاکانی ڕێحانە لە شۆربا و زەڵاتە و لێنانی گۆشتەکاندا بەکاردێت . هەروەها گوڵ و بەرە دەوڵەمەندەکانی بە زەیت لە پیشەسازی بۆن و دەرماندا و ڕەگەکانی لە پێستە خۆشکردندا بەکاردێت.

لەڕووی پزیشکییەوە گیراوەی ڕێحانە وەستێنەری خوێنبەربوونە، ئەندامە لاوازەکان و جومگەکانیش بەهێز دەکات، سوودمەندە بۆسکچوون و دڵەکوتێ و میزهێنیشە.

## ڕێحانە (الريحان) لە قورئانی پیرۆزدا



لە سەرەتادا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە ڕێحانە وەك ناوێك بەو ڕووەکانە دەوترێت کە بۆنی خۆشیان هەیە، ڕەنگە مەبەست پێی ڕۆزیش بێت، عەرەب دەڵێت: (خرجنا نطلب رِيحان الله) واتە چووینە دەرەوە بەدووی ڕۆزیی خوادا.

لە قورئانی پیرۆزدا دوو جار باسی ڕێحانە کراوە لەمیانەی باسکردنی هەندێك بەخششی خوا لەسەر بەندەکانی، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴿١٠﴾ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾الرحمن/ ١٠-١٣، واتە: زەوی بۆ خەڵك ڕاخستووە و باری هێناوە، چەندین جۆر میوەی تێدا دێتەبەر، هەروەها خورمای خاوەن دەفری گوڵدانی بۆ فەراهەم هێناون، چەندین جۆر دانەوێڵەی خاوەن کا و پەل و

پۆدار و بۆنخۆشی بەرهەم هێناوە، جا ئیتر ئەی مرۆڤ و پەری، بە کام لە ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕوا ناکەن، کامەی پەسەند ناکەن.

لە ئایەتە پیرۆزەکانەوە دەردەکەوێت کە لە مەزنترین بەخششەکانی خوای پەروەردگار لەسەر خەڵك ئەوەیە ڕێحانەی بۆ بەدیهێناون.

جاری دووەم لە سورەتی (الواقعة)دا هاتووە، کاتێك دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ﴾الواقعة/٨٣-٨٩، واتە: باشە! ئێوە بۆ بیرناکەنەوە، ڕۆژێك دێت کە: ڕۆحتان دەگاتە گەرووتان، ئێوەش بەدەوری ئەو کەسەدا بێ دەسەڵاتانە تەماشا دەکەن و سەرنج دەدەن، لەکاتێکدا کە ئێمە لە ئێوە نزیکترین لێی، بەڵام ئێوە نامانبینن. خۆئەگەر ئێوە زیندوو ناکرێنەوە و پاداشت نادرێنەوە، ئەو ڕۆحەتان دەگێڕایەوە ئەگەر ڕاست دەکەن و دەسەڵاتتان هەیە. جا ئەگەر ئەو کەسەی لە سەرەمەرگدایە لە نزیکان و خۆشەویستانی ئێمە بێت. ئەوە ئیتر خۆشی و کامەرانی و ئاسوودەیی بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەت چاوەڕێیەتی.

لەڕاستیدا ئەم ئایەتە پیرۆزانە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە ئەم قورئانە لە بەدیهێنەری زاناوەیە، چونکە کێ لەئێمە دەتوانێت هەواڵمان دەربارەی حاڵی ئەو کەسە بداتێ کە لە سەرەمەرگدایە؟! کەس نییە ئەو حاڵەتەی ئەزموون کرد بێت، چونکە بەرگەی تاقیکردنەوەکە ناگرێت، کێ دەتوانێت ئەو ساتەمان بۆ شرۆڤە بکات جگە لە بەدیهێنەری مەزن کە زیندووە و هەرگیز نامرێت؟!

ئایەتەکان دەریدەخەن مژدەیەکی باشە بۆ باوەڕدار لەکاتی مردنیدا کە فریشتەکە بە (ریحان) مژدەی پێبدات.

## ( ٧ ) ژەقنەبوت ( الزقوم )



کتێبەکانی تەفسیر دەڵێن: (الزقوم) دەستەواژەیەکی داڕێژراوە لە (تزقّم)ەوە کە بریتییە لە (بەناڕەحەت قوتدان)، ئەوەش بەهۆی ناخۆشی خواردنیەوە لەبەر ناشیرینی دیمەن و بۆنی.

شایانی ئاماژە پێکردنە جیاوازی لەنێوان ڕاڤەکاراندا هەیە لەسەر ماهیەتی داری ژەقنەبوت، بەمانای ئەوە کە ئایا داری دونیایە یان نا؟ هەندێك لە ڕاڤەکاران دەڵێن: داری ژەقنەبوت داری دونیایە. هەندێکیان بۆ ئەوە دەچن کە دارێکی گەڵا بچوکی تاڵە. هەندێکیان وتویانە: ژەقنەبوت هەموو ڕووەکێکی کوشندەیە، هیچ جۆرێکیان دیاری نەکردووە. هەندێك لە ڕاڤەکارانیش دەڵێن: ژەقنەبوت داری دونیا نییە، هاوشێوەیشی نییە.

## ژەقنەبوت (الزقوم) لە قورئانی پیرۆزدا

داری ژەقنەبوت لـە قورئانـدا (بـە نـاو) سـێ جـار هـاتووە، پـەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ﴾الصافات/٦٢-٦٦، واتـە: ئایا ئـەو بەهەشت و نـاز و نیعمەتـە چاکە یـان داری ژەقنـەبووت؟ ئێمـە کردوومانـە بەهۆی ناخۆشی و ئازار بۆ ستەمکاران. بێگومـان ئـەوە دارێکە لـە نـاخی دۆزەخدایـە و لـەوێوە (لـق و پۆپـەکانی) بەهــەموو بەشـەکانی دۆزەخـدا بڵاوکراوەتەوە. بەروبوومەکەی دەڵێی سەری شەیتانەکانە (لـە ناشـیرینی و بێتامیدا). دۆزەخییەکان بە ناچاری لێی دەخۆن، سکیانی لێ پڕدەکەن.

ئایەتە پیرۆزەکـان وەسفی دارێك دەکـەن کـە لـە دۆزەخـدا پێـدەگات، بەروبوومەکەی وەك سەری شەیتانەکانە.

با تـەماشای ئەم وێنە ناشیرینە بکەین، بـەروبوومی دارەکـە وەك سـەری شـەیتانە، ئەمـەش بـۆ دەرخسـتنی زۆر ناشـیرینی دیمەنەکەیـەتی. جـا کـە بـەروبوومی داری ژەقنـەبووت وەك سـەری شـەیتان بێـت، ئیـدی پرسـیار دەربارەی تامەکەی و ئەو کاریگەرییانەی مەکە کە لە هەناوی ئـەو کەسـەدا کـە دەیخـوات دروسـتی دەکـات. زانایـان دەڵـێن: خـوای گـەورە داری ژەقنەبووتی لە دۆزەخدا بـەدیهێناوە، کاتێـك دۆزەخییـەکان برسییان بـوو پەنای بۆ دەبـەن، هـەر کـە لێـی دەخـۆن وەك زەیتـی قرچاو لـە سـکیاندا دەکوڵێت. هەنـدێك لـە زانایـان لـە ڕاڤـەی ئـەم ئایەتـەی پـەروەردگاردا کـە دەفەرموێت: ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ﴾ دەڵێن: دارێك لە یەمـەن هەیـە

بەناوی سەری شەیتانەکانەوە، هەندێکیان وتویانە: سەری شەیتانەکان پۆلێکی مارەکانە.

قورئانی پیرۆز خۆراکی بێباوەڕانی نکۆڵیکار لە هەق و ڕاستی لە دۆزەخدا بە ترسێنەر و ناشیرین وەسف دەکات، خۆراکیان وەك شلەی زەیتی قرچاوە، یان وەك کانزای تواوەیە، هەر کە دەگاتە ڕیخۆڵەکانیان دەیسوتێنێت و دایدەڕزێنێت. لەمبارەیەوە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ﴾ الدخان/٤٣-٤٦، واتە: بەڕاستی داری ژەقنەبووت، بەروبوومەکەی خۆراکی تاوانبارانە. هەروەك کانزای تواوە لەناو ورگ و ڕیخۆڵەکاندا دەکوڵێت. وەك کوڵانی ئاوی یەکجار گەرم.

یان پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ﴾ الواقعة/٤٩-٥٥، واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ)) پێیان بڵێ: بێگومان پێشینان و پاشینان هەر هەموویان، کۆدەکرێنەوە و بەرەو مەیدانی ڕۆژی دیاریکراو ڕاپێچ دەکرێن. پاشان بێگومان ئێوە ئەی گومڕا و بێباوەڕان، ئەی ئەوانەی کە بڕواتان بە ڕاستییەکان نییە لە بەروبوومی داری ژەقنەبووت دەخۆن. سکتانی لێ پڕدەکەن. ئینجا ئاوی لەکوڵیشی بەسەردا دەکەن. هەروەکو ئەو حوشترانەی بەهۆی نەخۆشییەکی تایبەتییەوە تێرئاو نابن.

پێدەچێت هەر ئەوە بێت كە ئەم ئایەتە پیرۆزانەش ئاماژەی پێدەدەن:

﴿ وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴾المزمـل/١١-١٣، واتـە: وازبهێنـە لـە مـن و لـەو خاوەن ناز و نیعمەتانەی ئاییني من بە درۆ دەزانن، تۆ كـەمێك مۆڵـەتیان بدە. بەڕاستی ئێمـە كـۆت و زنجیر و دۆزەخمـان ئامادەكردووە (بـۆ ئـەو جۆرە تاوانبارانە). هەروەها خۆراكێـك كـە لـە گـەروو دەگیرێـت، سـەرەڕای سزای بەئێش و ئازار.

وتراوە: مەبەست لە ﴿وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ﴾ بریتییە لە داری ژەقنـەبووت كـە لەبینی ئەو بێباوەڕانە دەگیرێت كە دەرخواردیان دەدرێت، یان دڕكێكـە لـە گەروویان دەگیرێت و دەچێتە خوارەوە و نایەتە دەرەوە.

داری ژەقنەبووت لە قورئاندا بۆ ڕوونكردنەوەی بارودۆخی بێباوەڕانە لـە ڕۆژی دواییدا. لەڕاستیدا هـەر دەستەواژەیەك كـە وشـەی (الزقـوم)ی تێـدا هاتووە ناڕەحەتترین و قورسترین ژیان وێنەدەكێشێت، بەرەكەی قێزەونە و خۆراكی خۆی لە ئاگری دۆزەخەوە وەرگرتووە. ژەقنـەبووت خـۆراك نییـە، بەڵكو بێباوەڕ لە ئاگری دۆزەخدا بە زیندوویی دەهێڵێتەوە تاكو ئازارەكانی بەردەوام بن و ژیانی بریتی بێت لەتاڵی و ناخۆشی هەمیشەیی.

لە سۆز و بەزەیی پێغەمبەر (ﷺ) بەرامبەر نەتەوەكەی ئەوەیـە كـە لـە تاوانكاری ئاگاداریان دەكاتـەوە تـاكو سـەرەنجامیان خـواردنی ژەقنـەبوت نەبێت. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿بەڕاستی لـەخوا بترسـن و پارێزكـار بن، ئەگـەر تـەنها یـەك دڵـۆپ ژەقنـەبووت خرایـە نـاو دەریاكـانی دونیـاوە، ژیانیـان لێ تێكـدەدات، ئـیتر حـاڵی كەسـێك چـۆن دەبێـت ئەگـەر بـووە خواردنی؟﴾

## ( ٨ ) زەنجەفیل ( الزنجبيل )

ئەو زەنجەفیلەی دەیناسین و وەك خواردنەوە بەکاریدێنین قەدی زەمینی (السوق الأرضية)ی ڕووەکێکی (گیایی)یە کە درێژییەکەی لە مەتر و نیوێك زیاتر نییە. زەنجەفیل پێویستی بە پلەی گەرمی بەرزە.

دەوترێت ناوی زەنجەفیل لە بنەڕەتدا (فارسی)یە. زەنجەفیل چەند جۆرێکی هەیە بەناوبانگترینیان زەنجەفیلی سوورە، کە ڕووەکێکی گیایی گوڵ سوورە، نیشتمانەکەی مالیزیایە، بۆ جوانکاری و بەکارهێنانی پزیشکی دەڕوێنرێت، بەڵام زەنجەفیلی سروشتی هیچ پەیوەندییەکی بە زەنجەفیلی ڕاستەقینەوە نییە، کە ڕووەکێکی کورتی (گیایی)یە، گەڵاکانی لەشێوەی دڵدان، گوڵەکانیشی ڕەنگیان وەنەوشەیی مەیلە و قاوەیین.

زەنجەفیل وەك جۆرێکی بەهارات بەکاردێت و بۆنێکی تیژی هەیە، لە دروستکردنی ناندا بەکاردێت، بۆ خواردنەوەکان سەربار دەکرێت بۆئەوەی تامێکی خۆشی هەبێت. زەنجەفیل پایەیەکی دیار و ناسراوی لە پزیشکی میللیدا هەیە، دەچێتە نێو زۆرێك لە ڕەچەتە میللییەکانەوە کە زۆر لە گەلان بەکاریدێنن.

## زەنجەفیل (الزنجبيل) لە قورئانی پیرۆزدا

ناوی زەنجەفیل لە قورئانی پیرۆزدا تەنها یەك جار هاتووە لە میانەی وەسفی پەروەردگاردا بۆ یەکێك لەو بەخششانەی بۆ بەندە چاك و گوێڕایەڵەکانی ئامادەکردووە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا

عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا
تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا
تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴾الإنسـان/١١-١٧، واتـه: جـا خوای گەورەش لە شەڕ و ناخۆشی و نەهامەتی ئەو ڕۆژە پاراستنی و ڕووی گەش و شادمانی پێبەخشین. لە پاداشتی خۆگری و ئارامگرییاندا بەهەشت و ئاوریشـمی پێبەخشـین. ئـەو بەختەوەرانـە لەسـەر کورسـی و قەنەفـە ڕازاوەکان شانیان داداوە، نـە گـەرمای خـۆر بێزاریـان دەکـات، نـە کزەبـا و سـەرما سـەغڵەتیان دەکـات. سـێبەری دارە.جوانـەکان بەسـەر شـوێنە خۆشەکانیاندا سەری فروهێنا و لێکردنەوەی میوەکـانیش ئاسـانە و ملکـەچ کراوە. هەروەها لە سوراحی زیـودا شـەرابیان بـۆ دەگێـڕن و دەکرێتـە ئـەو کوپ و پەرداخانەوە کە لە شوشە و کریستاڵی تایبەت دروستکراون. هەموو



دام و دەزگـــای خـــواردن و خواردنـــەوەکان لـــە شووشـــەی زیـــوی دروســـتکراون بەشـــێوەیەکی جـــوان و دڵـــڕفێن. هـــەروەها شـــەرابێکی تریـــان پێشـــکەش دەکرێـــت کـــە ئاوێتەکـــەی زەنجەفیلە.

ئایەتـە پیرۆزەکـان لـە تابلۆیـەکی گوزارشتکاردا هەندێك لەو بەخششانەی نـاو بەهەشـت ڕوون دەکەنـەوە کـە چـاوەڕێی باوەڕدارانـە. یـەکێك لـەو بەخششانە شەرابێکە ئاوێتەی زەنجەفیلە. هەندێك لە ڕاڤەکاران لە ڕاڤەی

فەرموودەی پەروەردگاردا: ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا﴾ دەڵێن: واتە شەرابی بەهەشتیان بۆ تێکەڵی زەنجەفیل دەکرێت. ئەمەش ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە عەرەب حەزیان لە خواردنەوەیەکە زەنجەفیلی تێکەڵ کرا بێت، لەبەر بۆنخۆشی و ئەوەش کە هەرسکەری خۆراکە.

هەندێك لە ڕاڤەکاران، لەوانە "مجاهید"، وتوویانە: زەنجەفیل ناوی سەرچاوەیەکە لە بەهەشتدا تامی زەنجەفیلی هەیە".

لەوەی ڕابوورد دەردەکەوێت زەنجەفیل، کە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە، ڕەنگە ڕووەکە ناسراوەکە بێت، یان ناوی سەرچاوەیەك بێت لە بەهەشتدا... خوا زاناترە.

## ( ٩ ) زەیتون ( الزیتون )

لە هەزاران ساڵەوە زەیتون ناسراوە، ڕەنگە لەوکاتەوە کە مرۆڤ کشتوکاڵی کردووە ڕوێنرابێت. تەمەنی داری زەیتون لە زۆربەی دارە بەردارەکانی تر درێژترە. هەندێك لەو دارە زەیتونانەی لە ساڵی (١٤٠ز)دا ئیمپراتۆر "هادریان" ڕواندوونی هێشتا زیندوون، چەند دارێکی زەیتون لە فەلەستین هەن پێدەچێت تەمەنیان لە (٢٠٠٠ ساڵ) زیاتر بێت، هەروەها لە ئیسپانیا دارگەلێکی تێدایە هەزار ساڵیان بەسەردا تێپەڕیوە.

لەبنەڕەتدا زەیتون بۆ زەیتەکەی دەڕوێنرێت کە لە لێنانی خواردندا بەکاردێت. کشتیاری زەیتون بە نزیکەیی لە سەرجەم زەوییەکاندا سەرکەوتوو دەبێت مادام فشەڵ بن و بەئاسانی ئاویان پێدا ڕۆبچێت و زۆر

خوێداریش نەبن. بە چەند ڕێگایەك زەیتون دەڕوێنرێت، گرنگترینیان: تۆو ، براله و قەڵەم. دوو چەشنی بڵاوی زەیتون هەیە: یەکەمیان بەری گەورەی هەیە کە بۆ سرکە باشە و ئەوی تر بەرەکەی بچوکە و بڕێکی زۆر زەیتی تێدایە.

زەیتی زەیتون بە کوتانی بەری تەواو پێگەیشتوو پوختە دەکرێت کە ڕێژەی (٢٠-٣٠٪) زەیتی تێدایە، کرۆکی بەرەکەش لە (٦٠-٨٠٪)ی زەیت پێکدێت. زەیتی زەیتون جۆری هەیە: هەیە شیرینە و هەیە تیژە. ڕەنگی زەیتەکەشی زەردێکی مەیلە و سەوزە، هەرهەمووشی لە ڕۆنێکی ناتێر پێکدێت.

زەیتون و زەیتەکەی بەکارهێنانی پزیشکی جۆراوجۆریان هەیە، وەك: بەکارهێنانی لە چارەسەری ڕەقبوونی خوێنبەرەکان (تصلب الشراين) و سنگەکوژە و دابەزاندنی خوێنی بەرز و میزهێنیشە.



لێکۆڵینەوەکان جەخت دەکەنەوە کە دانیشتوانی ناوچەی دەریای ناوەڕاست کەمتر ئەگەری توشبوونیان هەیە بە نەخۆشییەکانی دڵ، ئەمەش ئاکامی بەکارهێنانی زەیتی زەیتونە لە زۆربەی ژەمە خواردنەکانیاندا، هەروەها کەمتر ئەگەری توشبوونیان بە کەمخوێنی هەیە.

## زەیتون (الزيتون) لە قورئانی پیرۆزدا

قورئانی پیرۆز داری زەیتونی پیرۆز کردووە کاتێك لە ئایەتێکدا خوای گەورە نووری خۆی بە چرایەك چواندووە لە شووشەیەکدا کە سوتەمەنییەکەی زەیتی دارێکی پیرۆزە ئەویش زەیتونە. زەیتی ئەم دارە پیرۆزە لە پلەیەکی بەرزی پاکی و بێگەردی و خەستیدایە بەڕادەیەك وەك ئەوە وایە خۆی ڕۆشنایی بدات. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾النور/٣٥، واتە: خوا نوور و ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوییە، نمونەی نوور و ڕووناکییەکەی وەك تاقێك وایە چرایەکی تێدا بێت، چراکەش لەناو شووشەیەکدا بێت، شووشەکەش وەك هەسارەیەکی گەش و پرشنگدار وابێت و بە ڕۆنی داری پیرۆز و بەفەڕی زەیتون داگیرسا بێت، ڕووی نە لە ڕۆژهەلات و نە لە ڕۆژئاوا بێت (لە شوێنێکدا بێت بەیانی و ئێوارە خۆر لێیبدات)، ڕۆنەکەشی (ئەوەندە پاك و بێگەردە) خەریکە خۆی دابگیرسێت و ڕووناکی بداتەوە، ئەگەر ئاگریش لێی نەدات، ئەو هیدایەت و ڕێنمونییە (کە قورئانە) ڕووناکییە لەسەر ڕووناکی، خوایش هیدایەتی ئەو کەسانە دەدات کە دەیەوێت و شایستەن بۆ لای نووری خۆی. خوا چەندەها نموونە دەهێنێتەوە بۆ خەڵکی، خوایش بە هەموو شتێك زانایە.

دەربارەی وتەی پەروەردگار: ﴿مَثَلُ نُورِهِۦ﴾ وتراوە: واتە ئەو نوورەی دەیخاتە نێو دڵی باوەڕدارەوە، وەك چرایەك وایە هۆیەكانی ڕۆشنكردنەوەی تێدا كۆبووبێتەوە. ڕاڤەكاران لە ڕاڤەی وتەی پەروەردگاردا: ﴿لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ﴾ وتوویانە: ئەم دارە لە بیاباندایە نە داری تر و نە شاخیش سێبەری بۆ ناكەن، هەر لە هەڵاتنیەوە لە بەیانیدا تا كاتی ئاوابوونی لە ئێوارەدا هیچ شتێك لە تیشكی خۆری دانابڕێت. هەموو دارێكی زەیتوونیش بەم شێوەیە، زەیتەكەی بێگەردترین زەیتە. لەلایەكی ترەوە ئەو دارەی تەنها لە بەشێكی ڕۆژدا خۆر لێیدەدا زەیتەكەی بەوجۆرە نییە و ڕۆشناییەكەشی كز و لاوازە.

ڕای جیاوازی تر دەربارەی ئەو بەشەی ئایەتەكە هەیە كە دەفەرموێت: ﴿لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ﴾، وتراوە: مانای وایە ئەو دارە لە وڵاتی شام دەڕوێت، كە نە خۆرهەڵاتی زەوییە نە خۆرئاوا، هەربۆیە وتراوە: باشترین زەیتون، زەیتونی وڵاتی شامە. هەندێك لە ڕاڤەكارانی تر دەڵێن: مەبەست لەو دارە یەكەمین دارە كە لەدوای تۆفانی نوح ڕواوە. یاخود دەڵێن: ئەو دارەی مەبەستی ئایەتەكەیە بەهیچ شێوەیەك لەسەر زەوی نییە، بەڵكو داری بەهەشتە، چونكە ئەگەر لە دونیادا بوایە ئەوا ڕووەو خۆرهەڵات یان ڕووەو خۆرئاوا دەبوو.

هەندێك لە ڕاڤەكاران ڕایەكی تریان هەیە، دەڵێن: مەبەست لە (مشكاة) سنگی محمدە(ﷺ)، شووشەكەش دڵیەتی، چراش ئەو ئاینەیە كە لەدڵیدایە. مەبەست لە وتەی پەروەردگاریش ﴿يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ﴾ واتە شوێنكەوتەی ڕێبازی ئیبراهیمە (سەلامی خوای لێبێت)، دارەكە

ئیبراهیمە پاشان وەسفی ئیبراهیمی کردووە بە وتەی ﴿لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ﴾ واتە وەك گاور و جولەکە ڕووەو خۆرئاوا یان ڕووەو خۆرهەلات نوێژی نەکردووە، بەلکو ڕووەو کەعبە نوێژی کردووە. ئیتر خوای گەورەش بە نیاز و مەبەستی خۆی زاناترە.

زانایان ڕوونیان کردووەتەوە کە ناوەڕۆکی ئایەتە پیرۆزەکە: ﴿يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ﴾ ئەوەیە وەها لە خەلك بکات وێنای تەواوێتی ڕووناکی و توندی چراکە بکەن، بەهێزترین ڕووناکی کە لە سەردەمی کۆندا خەلك ناسیبێتیان ڕووناکی زەیتی زەیتون بووە. ڕوونترین چرا لەلایان ئەوە بووە سوتەمەنییەکەی زەیتی زەیتون بووبێت کە لە لوتکەی چیاکان یان لە بیاباندا دەڕوێت و بەدرێژایی ڕۆژ خۆر لێیدەدات.

بۆ دلنیابوون لە ڕێزلێنانی قورئانی پیرۆز بۆ داری زەیتون، خوای گەورە لە سەرەتای سورەتی (التین)دا سوێندی پێدەخوات، وەك دەفەرموێت: ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾التين/١، واتە: سوێند بە هەنجیر و زەیتون.

لە ڕاڤەی (الزيتون) ی ئایەتەکەدا وتراوە: ئەو زەیتونەیە کە دەگوشرێت، یان وتراوە: کێوی (تینا)یە لە (بيت المقدس). یان: ئاماژەیە بۆ ئەو لقە زەیتونەی کە کۆترەکە هێنایەوە کاتێك نوح (سەلامی خوای لێبێت) بەریدا بۆ زانینی حالەتی تۆفانەکە، دوای ئەوەی گەڕایەوە ئەو لقە دارەی پێبوو، ئیتر نوح زانی زەوی دەرکەوتووە و ڕووەکی لێ ڕواوە.

قورئانی پیرۆز جارێکی تر بەخششەکانی بەدیهێنەرمان وەیاد دێنێتەوە، لەو بەخششانەش ئەوەیە کە خوای پەروەردگار بارانمان بەسەردا دەبارێنێت و جۆرە جیاوازەکانی بەرهەمی کشتوکالیمان بۆ دەڕوێنێت، لەو

بەرهەمانەش زەیتون، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾الأنعام/٩٩.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٖ مَّعۡرُوشَٰتٖ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖۚ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾الأنعام/١٤١.

یان دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ النحل/١٠-١١.

قورئانی پیرۆز خاوەن ئەقڵە دروستەکان و بەرچاو ڕوونەکان دەدوێنێت و داوایان لێدەکات تەماشا بکەن و بیر لە بەدیهێنانی خوا بکەنەوە، چونکە تەنها ئەوان توانای هەڵێنجانی ئەو ڕاستییەیان هەیە کە ئەم گەردوونە پەروەردگارێکی بێ هاوەڵی هەیە، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾

وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَائِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَاكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾عبس/٢٤-٣٢.

قورئانی پیرۆز کێشانی وێنەی ئەو بەخششانە تەواودەکات کە لە دونیادا بە بەندەکانی بەخشیوە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِ جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ﴾المؤمنون/١٨-٢٠، واتە: هەر ئێمە لە ئاسمانەوە بە ئەندازە و نەخشەیەکی دیاریکراو بارانمان باراندووە و لە ناخی زەویدا جێگیرمان کردووە، بێگومان ئێمە بە چەندین شێوە دەتوانین ئەو ئاوە لەناوبەرین و ئەو سەرچاوانە وشك بکەین. ئێمە بەهۆی ئەو ئاوەوە چەندین باخی خورما و ڕەزمان بۆ ئێوە بەدیهێناوە، (لەو باخ و باخچانەدا) میوەی جۆراوجۆری زۆر و زەبەندەمان بۆ بەدیهێناون، لە هەندێکیان دەخۆن. دارێکیشمان بۆ ڕواندوون کە ڕۆن و چەوری لێ دەردەهێنرێت و ئامادەیە بۆ کەسانێك کە دەیخۆن.

ڕاڤەکاران کۆکن لەسەر ئەوە کە داری مەبەست لە وتەی: ﴿وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ﴾ دار زەیتونە، وتوویانە: خوای گەورە تایبەتی کردووە بەوەی باسێکی زۆر گەورەی سوودەکانی کردووە، هەروەها وتوویانە: مەبەست لە وتەی پەروەردگار: ﴿تَنبُتُ بِالدُّهْنِ﴾ بریتییە لە زەیتی زەیتون، ﴿طُورِ سَيْنَاءَ﴾یش کە لە ئایەتەکەدا هاتووە ئەو شاخەیە کە بانگی موسا پێغەمبەری (سەلامی خوای لێبێت) لێوەکرا.

لەوەی ڕابوورد دەتوانرێت بوترێت داری زەیتـون پایەیـەکی نایابی لـە قورئانی پیرۆزدا پێدراوە، خوای پەروەردگار نوور و ڕۆشنایی خۆی بە داری پیرۆزی زەیتون چواندووە، لە زۆربەی باسەکانیشدا سوێندی پێخـواردووە. قورئانی پیرۆز دووپاتی کردووەتەوە یەکێك لە بەخششەکانی خـوای گـەورە لەسەر بەنـدەکانی ئەوەیـە کـە لـە دونیـادا زەیتـونی بـۆ فەراهـەم هێنـاون، دارێکـی بەسـێبەرە، لێیـەوە ڕۆن و پێخۆرێـك بەرهـەم دێـت بـۆ ئەوانـەی دەیخۆن، لەگەڵ چەندین سوودی تریش.

## (١٠) دارنەبك (السدر)

(سدر) لە دارە بلاو و باوەکانە لە سعودیە، بەرگەی وشکی و تینـوێتی و سوێری و جۆری جیاوازی زەوی دەگرێت. هەربۆیە بە مەبەسـتی جوانکـاری لە شەقام و گۆرەپانەکاندا دەڕوێنرێت.

نەبك (نبق) بەری (السدر)ە. لـە (تـاج العـروس)ی "زبیـدي" دا هـاتووە: باشـترین نـەبك لـەزەوی عەرەبـدا ناسرابێت بزیتییـە لـە (نبـق الهجـر)، کە شیرین و بۆنخۆشترینیانە، دەم و پۆشـاکی ئـەو کەسـەی دەیخـوات بۆنخۆش دەکات، وەك ئەوەی عـەتر دەیکات.



نـەبك لـە پزیشـکی میللیـدا بەکارهێنانی زۆری هەیـە: بەسـوودە

بۆ سکچوونی زۆر، گەدە بەهێز دەکات، ئەگەر خرایە سەر ئەو ئەندامەی خوێنی لێ دەچۆڕێت خوێنەکە دەوەستێنێتەوە، بناغەی مووەکان پتەو دەکات، گەلاکەی بۆ ڕەبۆ و نەخۆشییەکانی سی بەسوودە.

## دارنەبك (السدر) لە قورئانی پیرۆزدا

(السدر) لە قورئانی پیرۆزدا چوار جار لە سێ سورەتی جیادا ناوی هاتووە، ڕەنگە دیارترینیان لای باوەڕدار (سدرة المنتهى) بێت کە لە سورەتی (النجم)دا هاتووە، کاتێك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلۡفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ﴾النجم/١-١٨، واتە: سوێند بە ئەستێرە کاتێك لە شوێنی خۆی دەترازێت و بەخێرایی بەردەبێتەوە و ئاوا دەبێت. هاوەڵ و هاوڕێی ئێوە محمد (ﷺ) گومڕا و سەرلێشێواو نەبووە، لەڕێگای ڕاست و ڕەوان نەترازاوە. قسە و گوفتاریشی (ئەوەی کە قورئانە) لە ئارەزووبازی و هەواو هەوەسەوە نییە. ئەمەی کە ڕایدەگەیەنێت تەنها نیگا و وەحی خواییە. جوبرەئیلی فریشتە خاوەنی هێز و توانایی زۆر، قورئانی فێرکردووە. ئەو جوبرەئیلەی کە خاوەنی بیر و هۆشێکی زۆر بەهێز و دیمەنێکی جوان بوو، ئینجا لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی وەستا.

لەکاتێکدا لـە ئاسـۆی هـەرە بـەرز و بڵنـدەوە سـەری هەڵـدابوو، ئاسـۆی پڕکردبوو. لەوەودوا تا دەهات نزیك دەبووەوە و سەرەنجام هاتە خـوارەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ). ئەوەندە لێی نزیك بووەوە نێوانیان بەئەندازەی دوو کەوان یان کەمتریش بوو. ئینجا خوا لەڕێگای ئـەوەوە، نیگـای بـۆ بەنـدەی خۆی کرد، ئای چ نیگایەك بوو! ئەوسا ئەوەی کە بە چـاوی سـەری بینـی، لە ناخ و دەروونیەوە بڕوای پێی هەبوو، ناخ و دەروونی ڕاستییەکانی بەدرۆ نەدەزانی. جا ئایا ڕاستە؟ ئێوە مشتومڕی لەگەڵدا دەکەن لەسەر شتێك کە ئـەو دڵنیایـە لـە بینینـی؟ سـوێند بـەخوا بێگومـان جـارێکی تـریش لـە دابەزینێکی تردا جوبرەئیلی بینیوە. لەکاتێکدا لە (سـدرة المنتهـی)دا بـوو. لەوێدا بەهەشتی (مأوی) هەیە بە واتای لانە و جێگای حەوانەوە. کاتێك ئەو (سدرة)ی داپۆشی مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت کێن و چین و کاریان چییە. جا بینینی ئەو بەدیهێنراوانە لەو شەوەدا وەنەبێت چاوبەست لـە پێغەمبـەر (ﷺ) کرابێت و چاوی لێ لادابێت. بێگومان پێغەمبـەر (ﷺ) لەوشەوەدا لـە بەڵگـە و نیشـانە و مـوعجیزە گـەورەکانی پـەروەردگاری بینیـوە، بەچـاوی سەری، بە هەموو هەستی.

زانایان دەڵێن: (سدرة المنتهی) دارێکی زۆر مەزنە لە ئاسمانی حەوتەم و لەلای ڕاستی عەرشـەوەیە، لـە ژێریـەوە ڕووبارەکـان هەڵـدەقوڵێن و لەوێـدا بەهەشتی (مأوی)ی لێیە. زانایان ڕای جیاوازیان هەیـە لـە هۆکـاری ناونـانی ئـەو دارە بـە (سـدرة المنتهـی)، وتـراوە: لەوێـدا زانسـتی هـەموو دونیـا کۆتاییدێت، تەنها خوای گەورە دەزانێت چی لەپشتیەوە هەیـە. وتـراوە: وا ناونراوە، چـونکە هـەر فـەرمانێکی خـوایی دابـەزێت لەوێـدا وەردەگیرێـت و فریشتەی سەروو بۆ خوارەوە تێناپـەڕێت و فریشـتەی خـواروو بـۆ سـەرەوە

تێناپەڕێت. دەڵێن: وا ناونراوە، چونکە لە گەشتی ئیسرا و میعراجدا لەوێدا هاوڕێیەتی جوبرائیل بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆتایی هاتووە.

لە سۆز و میهرەبانی خوای گەورە بە بەندەکانی ئەوەیە کە لە قورئانەکەیدا چەندین چیرۆکی نەتەوەکانی پێشووی بۆ باسکردووین. سەرەنجامی ئەوانەیان چی بوون کە بێباوەڕ بوون؟ با پەند و ئامۆژگاری لە ڕووداوی ئەوانە وەربگرین. چیرۆکی (سبأ) یەکێکە لەوانە کە لەسورەتی (سبأ)دا باسکراوە: ﴿لَقَدۡ كَانَ لِسَبَإٖ فِي مَسۡكَنِهِمۡ ءَايَةٞۖ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٖ وَشِمَالٖۖ كُلُواْ مِن رِّزۡقِ رَبِّكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥۚ بَلۡدَةٞ طَيِّبَةٞ وَرَبٌّ غَفُورٞ ﴿١٥﴾ فَأَعۡرَضُواْ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ وَبَدَّلۡنَٰهُم بِجَنَّتَيۡهِمۡ جَنَّتَيۡنِ ذَوَاتَيۡ أُكُلٍ خَمۡطٖ وَأَثۡلٖ وَشَيۡءٖ مِّن سِدۡرٖ قَلِيلٖ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِمَا كَفَرُواْۖ وَهَلۡ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلۡكَفُورَ﴾ سبأ/١٥-١٧.

ئایەتە پیرۆزەکان ئاشکرایان کردووە کە خوای پەروەردگار دوو باخەکە و دیمەنە جوانەکان و سێبەر و ڕووبارە ڕۆیشتووەکان کە بە (سبأ)ی بەخشیبوو گۆڕی، هەموو ئەوانەی گۆڕی بە چەند دارێکی بەروبوم تاڵ و داری بێبەری وەك دارگەزۆ و دارنەبك (سِدر)، دارنەبك (سِدر) باشترینیان بوو، وەك زیادکردنی سزایان خوای گەورە ئەو (سِدر)ە باشەی کەم کردەوە، لەمبارەیەوە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَبَدَّلۡنَٰهُم بِجَنَّتَيۡهِمۡ جَنَّتَيۡنِ ذَوَاتَيۡ أُكُلٍ خَمۡطٖ وَأَثۡلٖ وَشَيۡءٖ مِّن سِدۡرٖ قَلِيلٖ﴾.

قورئانی پیرۆز بۆ بەهەشتمان دەبات، تاکو هەندێك لەو بەخششانەمان پێشان بدات کە پەروەردگار بۆ بەندە دڵسۆزەکانی ئامادەکردووە، لە سورەتی (الواقعة)دا هاتووە: ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِي سِدۡرٖ

مَّخۡضُودٖ (٢٨) وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ (٢٩) وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ (٣٠) وَمَآءٖ مَّسۡكُوبٖ (٣١) وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ
(٣٢) لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ (٣٣) وَفُرُشٖ مَّرۡفُوعَةٍ (٣٤) إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ (٣٥) فَجَعَلۡنَٰهُنَّ
أَبۡكَارًا (٣٦) عُرُبًا أَتۡرَابٗا (٣٧) لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾الواقعة/٢٧-٣٨، واتە: دەستەی ڕاستەکانیش، جا چوزانی کە ئەوانیش لە چ خۆشییەکدان. لەژێر سێبەری (سدر)ی بێدڕکدان. هەروەها ڕووەکی مۆزیش کە بەرهەمەکانی چین چین لەسەریەکن. لەژێر سێبەری دوور و درێژدان لەو باخە خۆشانەدا. تاڤگەی جوان و حەوز و فوارەی ڕازاوەی تێدایە. میوەی زۆر و هەمەچەشنیش. نە بەروبومی تەواو دە بێت، نە قەدەغەکراویشە. هەروەها ڕاخەری بەرز و بلندی لێیە. ئەو حۆریانەمان بەتایبەت بۆ دروستکردوون. کردومانن بە حۆریانی هەمیشە کیژ. هاوسەرەکانیان زۆر خۆشدەوێت و هەموویان هاوتەمەنن. ئەمانە هەمووی بۆ دەستەی ڕاستەکانن (ئەوانەی نامەی کردەوەکانیان درایە دەستی ڕاستیان).

لەم ئایەتە پیرۆزانەوە دەردەکەوێت یەکێك لە بەخششەکانی بەهەشت داری (سدر) ی بێدڕکە. ڕاڤەکارانی قورئان ڕای جیاوازیان لەسەر ﴿فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ﴾ هەیە، وتوویانە: ئەوەیە کە دڕکی نییە، یان وتراوە: (سدر)ی دونیا دڕکی نییە، بەڵام (سدر) ی بەهەشت دڕکەکەی نەهێڵراوە.

لەوەی ڕابوورد دەتوانرێت بوترێت قورئانی پیرۆز چوار جار و لە سێ سورەتدا باسی (سدر)ی کردووە. دوو جار بە تاك (سدرة- السدرة) و دوو جاریش بە کۆ (سدر). سێ جاریان واتە (سدر)ی بەهەشت و چوارەمیش (سدر)ی سەر زەوییە کە لە چیرۆکی (سبأ)دا هاتووە.

## (١١) مۆز (الطلح)

(طلح) ناوی عەرەبیی مۆزە -بەپێی زۆرینەی ڕایەكان-، وشەی (مۆز)یش لە وشەی هیندی (موز)ـەوە وەرگیراوە. كەسانی پێشین بە مۆزیان وتووە (خواردنی فەیلەسوفەكان)، چونكە خواردنێكی سەرەكی زانا و فەیلەسوفەكانی هیند بووە و یارمەتی داون بۆ بیركردنەوە و ڕامان. هەر لە سەردەمێكی كۆنەوە مرۆڤ خاسیەتەكانی مۆزی ئاشكراكردووە، لە بەڵگەنامەیەكدا كە مێژووەكەی بۆ (٣٠٢سالْ)ی پێش زاین دەگەڕێتەوە قسە لەسەر بەروبوومی ئاڵتونی و خاسیەتە خۆراكییەكانی هەیە. گێڕراوەتەوە كە مۆز لای ئاشوورییەكان پەسەند بووە بەر لە (١١٠٠سالْ) لە لەدایكبوونی مەسیحەوە.



مۆز لای هەموو نەتەوە و گەلەكان ناسراوە، بە تەنها گەلانی ئەمریكا و كەنەدا نزیكەی (٣/١)ی بەروبوومی جیهان بەكاردەهێنن، ساڵانە هەر تاكێك (١٠كگم) دەخوات، ڕەنگە ئەم بەكارهێنانە كەم بێت ئەگەر بەراورد بكرێت بە دانیشتوانی دەوڵەتی ئیمارات، كەتێكڕای بەكارهێنانی مۆزی هاوردە لەلایەن هەر تاكێكەوە دەگاتە (٤١ كیلۆگرام).

مۆز لەو میوانەیە كە بەدرێژایی ساڵ دەیبینین، چونكە لە وەرزە جیاوازەكانی ساڵدا گەشەدەكات، بەلاّم لە زستان و بەهاردا داواكاری و قەبوڵكردن لەسەری زۆرە. بەری مۆز نزیكەی (٧٠-٧٥٪) ی ئاوە، ڕێژەی ماددە كاربۆهیدراتەكان لە بەری پێگەیشتوودا دەگاتە (٢٤٪) و ڕێژەی

مادده پرۆتینییەکان دەگاتە (١-٢٪)، بەڵام ڕێژەی مادده چەورییەکان و ڕیشاڵەکان زۆر کەمە. مۆز کۆلیسترۆڵی تێدا نییە. لە هەمانکاتدا ڕێژەیەکی بـــەرزی کالیســـیۆم و ڤیتامینـــەکانی (A،B،G) لـــەخۆدەگرێت لەگـــەڵ ماددەکانی ئاسن و مەنگەنیز و فۆسفۆڕ و زینك.

تەنها سوود لە مۆز وەرناگیرێت، بەڵکو گەڵای هەندێك لە جۆرەکانی مۆز بەکاردێت بـۆ دروسـتکردنی سەربانی خانووەکـان و دروسـتکردنی جانتـا و سەبەتە و حەسیر.

مـۆز پایەیـەکی دیـاری هەیـە لـە پزیشـکی میللیـدا. "إبـن سـینا" لـە (القانون)دا وەسفی مۆزی کـردووە و تـوویـەتی: "مـۆز ژێبێنـەر و نـەرمکارە، بەسوودە بۆ سوتانی قوڕگ و سـنگ، مـەنی زیاددەکـات. ئامۆژگـاری دراوە بەپێدانی مۆز بـە منـالاَن لەگـەڵ شـیردا، هـەروەها بەوانـەی کـەم خـوێنی و لاوازی گشتیان هەیە و بە دووگیان و شـیردەرەکانیش. مـۆز چارەسـەرێکی دڵنیایە بۆ سیسی و لاوازی، بەسوودە بۆ کاری گورچیلە و کۆئەندامی میـز، هـەروەها زاکیـرە چـالاك دەکـات. بەگشـتی مـۆز بـە دابەزێنـەری پەسـتانی بەرزی خوێن دادەنرێت، لە خواردنە پەسەند و ڕێپێدراوەکانـە بـۆ نەخۆشـی بەرزە پەستانی خوێن.

خواردنی مۆز لەگەڵ پەنیر بە چارەسەرێکی کارا دادەنرێت بۆ هەندێك لە نارەحەتییەکانی سوڕی مانگانە، چونکە مۆز ڕێژەی خـوێن لێڕۆیشـتن کـەم دەکاتەوە. خواردنی مۆز لەگەڵ شیر زۆر بەسـوودە لـە حاڵـەتی گێژبوونـدا، لەهەمانکاتدا بۆ برینی گەدە (قرحة المعدة) بەسوودە. مۆز بۆ نەخۆشەکانی گرانەتا و سکچوون خۆراکێکی پەسەندە.

لـە دیـارترین بەکارهێنانـەکانی مـۆز لـە بـواری خزمـەتکردنی جـوانی ئافرەتدایە، بەتایبـەتی ڕووخسـاری. دەمامـك (ماسـك)ی مـۆز لـە باشـترین

دەمامکەکانە بۆ پێستی وشك، یارمەتی بەرگریکردنی دەرکەوتنی گرژی و ژاکانی ڕووخسار دەدات، بەڵام دانانی توێکڵی مۆز لەسەر شوێنی کوتراو بەجۆرێك کە دیواری ناوەوەی بەر پێستەکە بکەوێت لەگەڵ جێگیرکردنی بە کەرەستەی پێچانی تەڕکراو بە ئاوی سارد، یارمەتی هێورکردنەوەی ئازار و لابردنی شینبوونەوەی شوێنە توشبووەکە دەدات.

## مۆز (طلح) لە قورئانی پیرۆزدا

لە قورئانی پیرۆزدا یەك جار ئاماژە بە مۆز کراوە لە میانەی وەسفکردنی ئەو بەخششانەی خوای گەورە لە بەهەشتدا بۆ بەندەکانی ئامادەکردووە، بەجۆرێك کە هەموو شتێك بۆ خواردن ئامادەیە بەبێ ناڕەحەتی و هەوڵ و کۆششکردن. بەخششگەلێك لە بەهەشتدا هەن دەروونەکان حەزی پێدەکەن و چاوەکان چێژی لێدەبینن، هیچ شتێك لە بەهەشتدا قەدەغە نییە، لەمبارەیەوە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ﴾ الواقعة/٢٧-٣٨.

ئەو ئایەتە پیرۆزانە وێنەیەك لە وێنەی ئەو بەخششانە ڕوون دەکەنەوە کە خوای گەورە بۆ ئەو کەسانەی ئامادەکردووە کە نامەی کردەوەکانیان دەدرێتە دەستی ڕاستیان، لەو بەخششانەش خواردنە لە مۆزی چین چینی بەهەشت... زۆرینەی ڕاڤەکارانی قورئان وتوویانە (طلح) ڕووەکی مۆزە.

(منضود)یش چین چینی لەسەریەكە، قەدی دیاری نییە. بەمانا بەری مۆز لە بەهەشتدا بەسەریەكدا كەڵەكەبوون (ئەمە ڕای زمخشري و كلبي یە). هەروەها لە "أبی سعید و إبن عباس و أبی هریرة) وە گێڕراوەتەوە، وتوویانە: (طلح) مۆزە. "مجاهد و إبن زید"یش وتوویانە: خەڵكی یەمەن بە مۆز دەڵێن (طلح).

بۆئەوەی وێنەكە لای خوێنەر ڕوون و ئاشكرا بێت، دەڵێین: هەندێك لە ڕاڤەكارانی قورئان وتەی پەروەردگار: ﴿وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ﴾ یان بەشێوەیەكی تر لێكداوەتەوە، ئەوان وتوویانە: (طلح) دارێكە دڕكی زۆرە و لە زەوی حیجازدا دەڕوێت و ناوە تاكەكەی (طلحة)یە. ئێمەش دەڵێین: خوای گەورە بە مەبەستەكەی زاناترە.



## ( ١٢ ) نیسك ( العدس )

نیسك یەكێكە لە كۆنترین ئەو ڕووەكانەی مرۆڤ ناسیونی. لە هەریەكە لە (توراة) و (عهد القدیم)یشدا ناوی هاتووە. لە فەرموودەكانی پێغەمبەریشدا (ﷺ) باسی لێوەكراوە.

نیسك سەر بە پۆلی كەلودارەكان (قرنیات)ە و شێوەكەی لە شێوەی هاوێنە

(عدسة)دایە. هاوێنەکان (عدسة) کە لە چاویلکەی پزیشکیدا بەکاردێن ناوەکەی لە (عدس) وەرگیراوە، بەهۆی هاوشێوەیی لەگەڵ شێوەی تۆوی نیسك (عدس).

نیسك لە باشترین پاقلەمەنییەکانە لەڕووی بەهای خۆراکییەوە، چونکە دەوڵەمەندە بە پرۆتینی ڕووەکی و کاربۆهیدرات. مرۆڤ نیسك بەشێوەی جیاواز بۆ خواردنی خۆی بەکاردێنێت و لەهەندێك ولاتیشدا لەگەڵ ئالیکی ئاژەڵان تێکەڵ دەکرێت وەك خۆراکی ئاژەڵان و (مەڕو ماڵات و ئەسپ) بەکاردێت .

## نیسك (عدس) لە قورئانی پیرۆزدا

نیسك تەنها یەك جار لە قورئاندا ناوی هاتووە. ئاماژە بە نیسك دراوە لەگەڵ چەند ڕووەکێکی تردا لەسەر زمانی (بنو إسرائیل) لەمیانەی مشتومڕە بەناوبانگەکەیاندا کە لەنێوان ئەوان و پێغەمبەرەکەیان "موسا"دا (سەلامی خوای لێبێت) ڕوویدا و پەروەردگاریش لە قورئاندا تۆماری کردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ﴾البقرة/٦١، واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێك بە (موسا)تان وت: ئێمە هەرگیز لەسەر یەك جۆر خۆراك ئۆقرە

نـاگرین و بـە تـەنها جۆرێـك خواردەمـەنی ڕازی نـین، لەبەرئـەوە داوا لـە پەروەردگارت بکە لە ڕزق و ڕۆزیی و بەروبوومی زەویمان بۆ بەرهەم بهێنێت لە ڕووەکی پاقلەیی و خەیار و سیر و نیسك و پیاز، موسا پێیوتن: باشـە چۆن ئێوە شتی کەم و ناتـەواو وەردەگرن لـەجیاتی شتی لـەو چاکتر و باشتر؟ دە دابەزن بۆ شارێك (بیابانی سینا، بەجێ بهێڵن) ئینجا بەڕاستی ئـەوەی داوای دەکـەن دەستتان دەکـەوێت. (جا بـەهۆی ئـەو بیروباوەڕ و بیـانوگرتن و لاسـارییەیانەوە) سـوکی و ڕیسـوایی و لاتـی و زەبـوونی درا بەسەریاندا و شایانی خەشم و قینی خوایش بوون، چونکە ئـەوان بەڕاستی باوەڕیـان نـەدەکرد بـە ئایەتـەکانی خـوا و پێغەمبـەرەکانیان بـە ناھـەق دەکوشـت، ئـەوەش بـەهۆی ڕۆچـوونیانەوە لـە یـاخیبوون و نافەرمانیـدا، هەمیشە دەستدرێژیان دەکرد.

## (١٣) ترێ (العنب)

هەڵکۆڵراوە کۆنەکانی گەلا و تۆوەکانی ترێ دەریدەخەن کە مـرۆڤ هـەر لە سەردەمانی پێش مێژووەوە ترێی خواردووە، ڕەزگەریی لە نەخشـەکانی پەرستگا کۆنـەکانی میسـردا دەردەکـەوێت کـە مێژووەکـەی بـۆ سـاڵی (٢٤٤٠پ.ز) دەگەڕێتەوە.

تـرێ بەشـێوەی هێشـوو گەشـەدەکات و ژمارەیـەکی زۆری (بـەر) لەخۆدەگرێت ژمارەیان لەنێوان (٦-٣٠٠) بەرە. ڕەنگە بـەری ترێکە ڕەش، شین، یان ئاڵتونی مەیلەو سەوز، وەنەوشەیی، سور یان سپی بێت بـەپێی چەشنەکەی.

ساڵانە لەهەموو جیهاندا پتر لە (٦٥ ملیۆن تۆن) مێو دەچنرێتەوە، (٨٠٪)ی ئەو بڕە لە دروستکردنی (مەی)دا بەکاردێت و نزیکەی (١٣٪)ی بەشێوەی تریێ دەفرۆشرێت کە وەك میوەی تازە دەخورێت. بڕەکەی تریشی بە وشکی وەك مێوژ یان لە دروستکردنی شەربەت یاخود خۆشاودا بەکاردێت.

تریێ میوەیەکی دەوڵەمەندە بە شەکر، بۆیە چالاکی جەستە زیاد دەکات، یارمەتی جوڵەی ئەندامەکان دەدات. تریێ دەوڵەمەندە بە ئاوێتەکانی ئاسن کە پێویستن لە پێکهاتنی خڕۆکە سوورەکانی خوێندا. هەروەها تریێ بۆ کۆکە و ڕەوانیش بەسوودە.

لەڕاستیدا تریێ هەمووی هەر سوودە، تەنانەت دەنکەکانیشی کە سەرچاوەی زەیتن، بۆ پیشەسازی سابوون و ڕەنگ و بۆیەکان بەکاردێت. پاشماوەی دەنکەکانیش لەدوای کرداری پوختەکردنی زەیتەکە وەك ئالفی مەڕ و ماڵات بەکاردێت.

## تریێ (العنب) لە قورئانی پیرۆزدا

تریێ لە دیارترین ئەو ڕووەکانەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا ناویان هاتووە، ١١ جار و لە ١١ سورەتدا.

هێشتا قورئانی پیرۆز بەخششەکانی خوای گەورە بەسەر بەندەکانیەوە بیردەخاتەوە کە لەهەژمار نایەن، لەو بەخششانە ئەوەیە کە پەروەردگار بەپێی پێویستی بەندەکانی لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت، پاشان بەو بارانە ڕەز و باخی جوان دەردەکات، هەروەها جۆری جیاوازی بەرهەمی کشتوکاڵیمان بۆ دەردێنێت، لەنێویاندا و بەڕێزترینیان تریێیە، لەمبارەیەوە

پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾المؤمنون/١٨-١٩، واتـە: هـەر ئێمـە لـە ئاسمانـەوە بـە ئەندازە و نەخشەیەکی دیاریکراو بارانمان باراندووە و ئینجا لەناخی زەویدا جێگیرمان کردووە، بێگومان ئێمە بەجۆرەها شێوە دەتوانین ئەو ئاوە لەناوبەرین و ئەو سەرچاوانە وشك بکەین. ئێمە بەهۆی ئەو ئاوەوە چەندین ڕەز و بـاخی خورما و ترێمان بـەدیهێناوە بۆتـان، میـوەی جۆراوجـۆری زۆر و زەوەندەمان بۆ بـەدیهێناون، لـە هەنـدێکیان دەخۆن.



یـان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾الأنعام/٩٩.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ١٠ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ النحل/١٠-١١.

یــان دەفــەرموێت: ﴿ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ٣٣ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ٣٤ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴾يس/٣٣-٣٥، واتە: لە بەڵگە و نیشانەی ئاشکرای خوا بۆ ئەو خەڵکە: زەوی مردووە کە بەهۆی ئاوی بارانەوە زیندووی دەکەینەوە، دانەوێڵەی لێ پەیدا دەکەین کە لێی بخۆن. هەروەها چەندین جۆر باخی لێ بەرهەم دەهێنین، لە دارخورما و چەند جۆر ترێ، هەروەها چەندین کانیاویشمان تیادا هەڵقوڵاندووە. بۆئەوەی لە بەروبوومەکەی بخۆن، لەوەش کە بەدەستی خۆیان لەو بەروبوومانە دروستی دەکەن. ئایا لەبەرامبەر ئەو هەموو ناز و نیعمەتانەوە سوپاسگوزاری ناکەن؟!

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ٢٤ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا ٢٥ ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا ٢٦ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ٢٧ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ٢٨ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ٢٩ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ٣٠ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ٣١ مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ٣٢ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ﴾ عبس/٢٤-٣٣.

لەو ئایەتانەدا قورئانی پیرۆز باس لە ترێ دەکات لە میانەی ئەو بەخششانەدا کە خوای پەروەردگار لە دونیادا بەخەڵکی بەخشیوە، قورئانی پیرۆز بڕیاردەدات ئەم بەخششانە شایستەی تەماشاکردن و بیرکردنەوەن لە

توانای بەدیهێنەرەکەی و لە پاشان سوپاسگوزاری کردنی بەخشەرەکەی، لەبەرئـەوە ئایەتـەکان کۆتاییانهـاتووە بـە دەسـتەواژەکانی ﴿لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ و ﴿أَفَلَا يَشۡكُرُونَ﴾. لە ئایەتەکانەوە تێبینی دەکرێت کە تریێ (العنب) بە تایبەتکراو و بە (ناو) هاتووە، ڕەنگە هۆیەکە ئەوە بێت کە تـریێ بـەجێی خـواردن و پێخـۆر و وەك میـوە بـە پێگەیشـتوویی و وشـکیش دەخورێت.

پاشـان قورئـانی پـیرۆز دەمانبـات بۆ وێنەیـەك کـە توانـای بێسنووری پەروەردگار ڕوون دەکاتەوە. چەند پارچە زەوییەکی هاوسێ و هاوشێوە لە هـەموو سـیفەتەکانیاندا هـەن، زیـاد لـەوەش سـەرجەمیان بەهـەمان ئـاو ئاودەدرێن، بەڵام دواتـر بـەرووبوومی جیاوازمـان دەدەنـێ: ئەمـەیان بـاش و سوودمەندە و ئەوەشیان زەرەرمەند، ئەمەیان دەرمانە و ئەوەشیان ژەهـر، هەموو ئەمانە لەگەڵ نزیکی زەوی و لێکچوون و ئاودانیشیان بەهـەمان ئـاو. بەدڵنیاییەوە هەموو ئەمانە بە پەنجەیان ئاماژە بۆ ئاسمان دەکەن تـا بڵـێن "لاإله إلاّ الله القادر الفاعل"، لەمبارەیەوە پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾الرعد/٤، واتە: لەسەر ڕووکاری زەوی پارچەی جۆراوجۆر هەیە لەپاڵ یەکدا، هەروەها ڕەزی تریێ، کشتوکاڵی هەمەجۆر لە دانەوێڵە و بێستانەکاندا، دارخورمای یەك قەد و دوو قەد، هـەموو ئەمانـە بـە یـەك ئـاو ئاودێر دەکرێن و لەیەك جۆر ئاو دەخۆنەوە و هەندێکیانمان لە هەندێکی تـر

بۆ خۆراکی مرۆڤ نازدارتر و پەسەندتر کردووە، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك ئەقڵ و ژیری خۆیان بخەنە کار.

ئایەتە پیرۆزەکە ئاشکرای دەکات کە خوای پەروەردگار بە توانای بێسنووری خۆی جیاوازی کردووە لەنێوان شتەکاندا و بەوشێوەیەی خۆی دەیەوێت بەدیهێناون، هەر بۆیە ئایەتەکەی بەم دەستەواژەیە تەواوکردووە ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾.

لەلایەکی تری وێنەکەوە قورئانی پیرۆز ئاماژە بە توانای پەروەردگار دەدات، کە تەنها هەر خۆی توانای هەیە ئالف -کە ئاژەڵان دەیخۆن- بۆ شیرێکی پاك و بێگەرد و خۆش بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە بگۆڕێت، لەمبارەیەوە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ النحل/٦٦-٦٧، واتە: بەڕاستی لە بوونی ماڵات و (زیندەوەرانی جۆراوجۆردا) پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆتان و جێگای سەرنج و تێڕامانە، لەنێوان ئەو شتانەی کە لە سکیاندا هەیە، لەنێوان گژوگیای هەرسکراو و خوێندا، شیرێکی پاك و بێگەرد و خۆش و بەتام بەرهەم دەهێنین بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە. لە بەروبوومەکانی دارخورما و ڕەزی تریش (هەندێجار) شتی سەرخۆشکەر دروست دەکەن، (گەلێ جاریش) بەرهەمی چاك و بەسوود، بەڕاستی ئا لەوانەشدا بەڵگە و نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ کەسانێك ئەقڵ و ژیری خۆیان دەخەنە کار.

لەم تابلۆ ناوازەیەدا قورئانی پیرۆز سەرنجمان بۆ توانای بەدیهێنەر ڕادەکێشێت کە جۆری جیاوازی بەروبوومان بۆ دەردێنێت. بەتایبەتیش

باسی لـه خورمـا و ترێیـەکان کـردووە، ڕەنگـه لەبەرئـەوە بێـت کـه ئەوانـه باشترین بەروبوومن له ژینگەی خەڵکی مەککەدا، وتراوە: ڕەنگـه هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوە که خورما و ترێ له باشترین بەروبوومەکان بن کـه هـیچ شتێك جێیان ناگرێتەوە. مـرۆڤ بـه گـەییوی و نەگـەییوی سوود لـه خورمـا وەردەگرێت و لـه تـرێش شـەربەت و مێـوژ و سرکه دروسـتدەکات. پاشـان قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەوە داوە که ڕەنگه مرۆڤ بەخششی خوا بـه خـراپ بـەکاربێنێت و بـاش بـۆ خـراپ بگۆڕێـت. لەمبارەیـەوە پـەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًاۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾النحل/٦٧.

سـەرجەم ڕاڤـەکاران وتوویانـە: ئـەم ئایەتـە بـەر لـه حـەرامکردنی مـەی دابەزیوە، لەڕاستیدا سورەتی (النحل) خۆی سوورەتێکی مەککییە و پـێش حەرامکردنی (مەی) دابەزیوە. پێدەچێت وەسفی قورئانی پیرۆز بـۆ ڕۆزیـی باش (بۆ بەرهەمهێنانی جۆرەکانی تری جگه لـه مـەی) بـەرەکانی خورمـا و ترێوە ئەوە ڕوونبکاتەوە که دید و تێڕوانینی قورئان بۆ مەی لـه سـەرەتای دابەزینیەوە له مەککە بۆ دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی لـه مەدینـه هـیچ نەگۆڕاوە.

دەگەڕێینەوە بۆ ئایەتە پیرۆزەکە که پەروەردگار بە دەسـتەواژەی ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ کۆتـایی پێهێنـاوە، واتـه بەرهـەمهێنانی خورمـا و ترێکان و بەروبوومەکانیان بەڵگەن لەسەر تاك و تەنهایی خوا لـه ئولوهیـەت و لەسەر توانـای بێسـنووری لـه بەدیهێنانـدا، تـەنها ئـەو زاتـه پەرسـتراوە. پاشان کۆتایی ئایەتە پیرۆزەکە لێرەدا زۆر شیاو و گونجاوە، چـونکه ئـەقڵ

بەڕێزترینە لە مرۆڤدا، هەر بۆ پارێزگاری ئەقڵەکانمانە کە (مەی) حەرام کراوە.

قورئانی پیرۆز هەواڵمان دەداتێ کە ترێ یەکێکە لە بەخششەکانی خوای گەورە لە دونیادا، هەروەها پێمان ڕادەگەیەنێت کە ترێ یەکێك لە وێنەکانی بەخششە کە چاوەڕێی پارێزکارانە لە بەهەشتی نەمریدا، لەمبارەیەوە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا﴾ النبأ/٣١-٣٦، واتە: بەڕاستی بۆ خواناس و پارێزکاران سەرفرازی و خۆشی و شادی و کامەرانی فراوان ئامادەیە. چەندین باخچەی جوان و جۆری ترێ. ئافرەتانی سینە جوان و هاوتەمەن ئامادەیە. لەگەڵ کاسەی پڕ لە شەرابی تایبەتیدا. لەو بەهەشتەدا هیچ جۆرە قسەیەکی پڕوپووچ و درۆ و دەلەسەیەك نابیستن. ئەمەش هەمووی پاداشتێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە (ئەی باوەڕدار)، بەخششێکە بە حسابێکی ورد دەبەخشرێت.

ئایەتە پیرۆزەکان دەمانبەن بۆ بەهەشتی نەبڕاوە، تاکو وێنەیەك لە وێنەکانی بەخشین ببینین، ئەوە پارێزکارانن لە ترێکانی بەهەشت دەخۆن، چەند بەتامە!!

کەواتە زانیمان ترێ یانزە جار لەقورئاندا هاتووە، وشەی (عنب) دوو جارهاتووە (لەسورەتی الإسراء و عبس) نۆ جاریش لە سورەتەکانی (الأنعام، الرعد، الكهف، المؤمنون، يس، النحل، النبأ)دا.

## ( ١٤ ) سیر ( الفوم )

بەپێی زۆرینەی بۆچوونەکان (الفوم) لە زمانی عەرەبیدا بریتییە لە سیر (الثوم)، ئەگەرچی هەندێك کەس بە ڕووەکێکی جیا لە سیری دادەنێن، وتراوە: سیر (الثوم) وتراوێکی فیرعەونی کۆنە.

سیر دەچێتە ناو ڕەچەتەی چارەسەری زۆرێك لەنەخۆشییەکانەوە، وەك: خراپی هەرس، گازات، ژانەسك و گرانەتا، هەروەها پاککەرەوەی گەدەیە و ئەمیبا و دوسنتاریا لەناودەبات، چارەسەرێکی بەسوودە بۆ هەلأمەت و سەرمابوون و ئەنفلۆنزا.



لە ئاکامی لێکۆڵینەوەیەکی نوێدا کە زانایانی ڕوسیا پێیهەستاون، هاتووە: هەڵمی بەرزەوەبوو لە سیری بێتوێکڵ یان پارچەکراو بەسە بۆ کوشتنی زۆر لە میکرۆبەکان، بینیویانە کە میکرۆبەکانی سیل و دفتیریا بە بەرکەوتنیان بە هەڵمی سیر بۆ ماوەی پێنج خولەك لەناودەچن. لەکۆتاییدا جەخت کرایەوە جوینی سیر بۆماوەی (٣ خولەك) ئەو میکرۆبانە لەناودەبات کە لە جووت ئاڵو (لوزتین) دا کۆبوونەتەوە.

## سیر (الفوم) لە قورئانی پیرۆزدا

دیسانەوە دەگەڕێینەوە بۆ ئایەتی (٦١)ی سورەتی (البقرة)، تاکو وێنەیەکی تری نکوڵیکردن و یاخیبوونی (بنو إسرائیل) ببینین، ئەوان بە منەتی خوایی لەسەریان ڕازی نەبوون کە لە گەزۆ و باڵندەی شەلاقەدا خۆی دەنواند، ئەوەتا داوا دەکەن زەوی ڕووەکی خۆییان بۆ دەربێنێت، یەکێك لەوانەی داوایانکرد بریتی بوو لە سیر... پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُخۡرِجۡ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۢ بَقۡلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا﴾ البقرة/٦١، واتە: داوا لە پەروەردگارت بکە لە ڕزق و ڕۆزی و بەروبوومی زەویمان بۆ بەرهەم بهێنێت لە ڕووەکی پاقلەیی و خەیار و سیر و نیسك و پیاز.

ڕای جیاواز دەربارەی مانای وشەی (الفوم)ی ئایەتەکە هەیە، بەڵام کۆی ڕایەکان لەسەر ئەوەن کە یان سیرە یاخود گەنم و نان. خوای گەورە بە مەبەستی زاناترە.

## ( ١٥ ) خەیار ( القثاء )

ڕەگی ڕووەکەکەی لقدارە وەك تۆڕێك، قەدەکەشی خشۆك و درێژبووەوە و بۆشە، گەڵاکانیش سوك و بچوك و بازنەین، لێوارەکانیان تەواون یان قاش قاش، ڕووی گەڵاکان دەزوولەیان لەسەرە. بەرەکەی درێژکۆلەیە. تۆوەکان هێلکەین، ڕەنگیان سپییە یان شین.



خەیار وەك جۆرێك لە زەڵاتـە بـەکاردێت، هـەروەها لـە پزیشـکی میللیـدا بـەکارهێنانی هەیە، پلەی گەرمی لەش کەم دەکاتەوە و بۆ گەدە بەسوودە و میزهێنیشە.

## خەیار (قثاء) لە قورئانی پیرۆزدا

جارێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ ئایەتی (٦١) ی سورەتی (البقرة) دەبینین خەیار لەو پێنج ڕووەکـەدا باسـکراوە کـە (بنـو إسـرائیل) پەسـەندیان کـرد بەسـەر گـەزۆ و باڵنـدەی شەلاقەدا کە خوای پەروەردگار لە بیابانی (سینا)دا بۆی دابەزاندن.

لە ئایەتە پیرۆزەکەدا تێبینی دەکـەین خـەیار یەکـەم ڕووەکـە کـە (بنـو إسرائیل) بە دیاریکراوی ناویان هێناوە. ئەوان داوایان کرد زەوی (البقل)یان بۆ بڕوێنێت، وتراوە: ڕووەکی پاقلەیی ئەو ڕووەکە پێگەییوەیە کـە خـەڵك و ئاژەڵانیش دەیخۆن.

هۆیـەکی دیاریکراومـان لانییـە وای لـە (بنـو إسـرائیل) کردبێـت خـەیار پەسەند بکەن بەسەر گەزۆ و باڵندەکەدا و لەپێشەوەی ئەو ڕووەکانەی تردا داوای بکەن کە بە (ناو) لە ئایەتەکەدا هاتوون.

## (١٦) كافوور (الكافور)

درەختەكانی كافوور تەمەن درێژن، قەدەكانیان درێژە، گەڵاكانیان سەوزە، گوڵەكانیان سپییە، بەزۆری لە یابان و چین و دوورگەی تایوان گەشە دەكەن. ئوستراليا بە نیشتمانی بنەڕەتی كافوور دادەنرێت.

كافوور بەو ماددەیەش دەوترێت كە لە دارەكەی دەردەهێنرێت. ئەم ماددەیە دەردەهێنرێت بە بەركەوتەبوونی پارچەیەك تەختەی داری كافوور بە هەڵم، كافوورەكە لەسەر پارچە تەختەكە دەیبەستێت و چینێكی شێوە زەیتی دروستدەكات. ئەم ماددەیە كۆدەكرێتەوە و كافووری لێ پوختەدەكرێت بەشێوەی كریستاڵی نیمچە ڕوون كە مەیلە و ڕەنگی سپییە و كریستاڵەكان بە كرداری بەهەواداچوون نامێنن. ئەمەش ڕێگایەكە تیایدا كافوور لە دۆخی ڕەقییەوە یەكسەر دەچێتە دۆخی گازی و خەوش لەدوای خۆی جێدێڵێت. لە ئێستادا كیمیاییەكان لە تاقیگەدا دەستكردانە كافوور بەرهەم دێنن. كافوور لە ئامادەكراوەكانی جوانكاری و داوودەرماندا بەكاردێت. ڕۆحی كافوور وەك دەرمانێكی پاككەرەوە بەكاردێت كە لەتێكەڵەیەك لە كافوور و كهول و ئاو پێكدێت بە ڕێژەكانی (١٠:٧٠:٢٠) یەك لەدوای یەك. دەوترێت: كافوور بەسوودە بۆ ژانەسەر و ئاوساوی و چاوئێشە.

## کافوور (الكافور) لە قورئانی پیرۆزدا

کافوور وەك زەنجەفیل هەریەکەیان یەك جار لە قورئاندا هاتوون لە میانەی مژدەدانی بەندە باوەڕدارە پاك و چاکەکانی خوا بەوەی پەروەردگاریان لە بەهەشتدا بۆی ئامادەکردوون لە پاداشتی ئەو ناسین و خۆشەویستییەی لە دڵیاندایە بەرامبەر پەروەردگاریان و کاری چاکە دەکەن و گوێڕایەڵن. لەمبارەیەوە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ۝٥ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾ الإنسان/٥-٦، واتە: بێگومان چاکان و پاکانیش لە پەرداخێکی پڕ لە شەرابدا دەخۆنەوە، ئاوێتەکەی لە سەرچاوەی کافوورەوەیە. کە کانییەکە بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوە لەهەر شوێنێکدا بیانەوێت هەڵی دەقوڵێنن و فوارە دەکات.



ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە ڕوونی دەکەنەوە یەکێك لەو بەخششانەی پەروەردگار بۆ ئەو بەندە چاکانەیی ئامادە کردووە خواردنەوەیەکی بەتام و چێژی (مەی)ە کە بە کافوور تێکەڵ کراوە، ئەو کافوورە لەوپەڕی تام و چێژدایە، لە ڕاڤەی وتەی پەروەردگاردا: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ دەڵێن: لە باشی و خۆشی بۆنەکەیدا وەك کافوورە، هەروەك ئەوەی

ستایشی خواردنێك دەکەین و دەڵێن: وەك میسکە. وتراوە: (مەی)ی بەهەشت لە سپێتی و بۆنخۆشیدا وەك کافوور وایە.

پێدەچێت ئەم وێنەکێشانە بەهۆی ئەوەوە بێت کە عەرەب پەرداخە مەیەکانیان بۆ چێژی زیاتر هەندێجار بە کافوور و هەندێجاری تریش بە زەنجەفیل تێکەڵ دەکەن. بەگشتی کەس نازانێت ئاست یان جۆری تام و چێژی بەهەشت دیاری بکات.

هەندێك لە ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز لەو باوەڕەدان کە کافوور لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئەو کافوورە نییە کە لای هەموان ناسراوە، بەڵکو ناوی سەرچاوەیەکی ئاوە لە بەهەشتدا کە بۆن و سپێتییەکەی لە کافوور دەچێت... ئیتر خوای گەورە بە نیاز و مەبەستی خۆی زاناترە.



## ( ١٧ ) دارخورما ( النخيل )

دارخورما کۆمەڵە ڕووەکێکن کە تەمەنیان بۆ ڕابردوویەکی دوور دەگەڕێتەوە، هەڵکۆڵراوی گەڵای دارخورما دۆزراوەتەوە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی خشۆکەکان (بەر لە نزیکەی ٢٤٠ملیۆن بۆ ٦٢ ملیۆن ساڵ).

زیاتر لە (٢٧٠٠ چەشن) دارخورما هەیە، ئەم چەشنانەش زۆر جیاوازن لەڕووی قەبارەی دارەکان و شێوەی گەڵا و گوڵ و ئەو بەروبوومەی

بەرهەمی دێنن. زۆربەی چەشنەکانی دارخورما قـەدێکی ڕێک و ڕاستیان هەیە، لە هەندێك جۆردا قەدەکەی بەسەر زەویدا درێژدەبێتـەوە، لەهەنـدێك جۆری تـردا قەدەکـەی لـە خاکدا نقوم دە بێـت، چـەند چەشنێکی تـری دارخورما هەن چەند قەدێکی جیاوازیان هەیە کە لە هەمان بنکـەی ڕەگـەوە دەردێن.

دارخورمـا: سـێبەر، مـاددەی دروسـتکردنی خـانوو و سـوتەمەنیمان دەداتـێ، هـەروەها پیشەسـازی پـەتکاری و گسـك پشـت بـە دارخورمـا دەبەسـتن، ، لــە دارخورمــا زەیــت بەرهــەم دێـت کــە لــەخواردن و ڕووناککردنەوەدا بەکاردێت. هەندێجار تۆو (یان ناوك)ی خورما بەکاردێت لە کاری دوگمە و هەڵکۆڵراوەکاندا (منحوتات)، هـەروەها لـەدوای هـاڕینی وەك ئالفی ئاژەڵان بەکاردێت.

دارخورما (نخيل التمر)، لە ئاووهەوای گەرم و وشـکدا گەشـەدەکات. لـە کۆنترین ئەو دارانەشـە کـە مـرۆڤ بەرهـەمی هێنـاوە. شارسـتانییە کۆنـەکان بەلایەنی کەمەوە پێش پێنج هـەزار سـاڵ دارخورمایـان چاندووە، کـۆنترین شـوێنەواریش کـە بەڵگەیـە لەسـەر چـاندنی دارخورمـا لـە (بابـل)ە کـە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چوار هەزار ساڵی پێش زاین. لە میسریشدا بـەر لە سێ هەزار ساڵ پێش زاین.

خورمـا ڕێژەیـەکی زۆر کاربۆهێـدراتی بەرهـەمهێنی چـالاکی و جوڵـەی تێدایە. ئاوێتەکانی ئاسـن لـەخۆدەگرێت کـە دەچـنە پێکهاتـەی خوێنـەوە، هەروەها بڕێك لە کالیسیۆم کە دەچێتە پێکهاتەی ئێسك و ددانەوە.

شـیکارییە نوێیـەکان سـەلماندوویانە کـە گلکـی خورمـا (طلـع النخـل) پێکهـاتووە لـە (١٧٪)ی شـەکر و (٢٢٪)ی پـرۆتین و ڕێژەیـەکی بـەرز لـە کالیسـیۆم. هـەردوو ڤیتـامین (G،B) لـەخۆدەگرێت، سـەرباری فۆسـفۆڕ و

ئاسن. سەلمێنراوە كە هۆرمۆنی (ئیسترۆن)ی تێدایە كە هێلكەدان (مبيض) چالاك دەكات و سوڕی مانگانە ڕێكدەخات.

## دارخورما (النخيل) لە قورئانی پیرۆزدا

دارخورما لە ڕووەكەكانی تر پتر لە قورئاندا ناوی هاتووە، دارخورما و پێكهاتەكانی زیاتر لە (٤٠) جار ئاماژەی پێدراوە. ڕەنگە ئەوەش بگەڕێتەوە بۆ بایەخی خورما لە كۆمەڵگای عەرەبیدا پێش هاتنی ئاینی ئیسلام و پەیوەستی عەرەب پێیەوە و كاریگەری گەورەی لەسەر ژیانیان، دارخورما كشتوكاڵ و خۆراك و سامانی بووە. ئەوەی دڵنیایی لە پایەی دارخورما دەكات لە كۆمەڵگای عەرەبی بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام كە ناونیشانی سامان و پلەوپایە و ڕەنگە هێز و تواناش بوو بێت، هەروەك ئەوە كە لەقورئانی پیرۆزدا لەسەر زمانی بێباوەڕانی قوڕەیش هاتووە لە یەكێك لە مشتومڕەكانیاندا لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ): ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا﴾الإسراء/٩٠-٩١، واتە: وتیان: هەرگیز ئێمە باوەڕ بە تۆ ناكەین تا كانی و سەرچاوەیەكمان لە زەوییەوە بۆ هەڵنەقوڵێنیت. یاخود دەبێت خاوەنی باخێك بیت كە پڕبێت لە دارخورما و ڕەز و چەندین ڕووبار لەناویدا هەڵبقوڵێت و بەخوڕ و ڕەوان بە ژێریاندا بڕوات.

قورئانی پیرۆز دارخورمای ڕێزدار كردووە بەوەی كردویەتیە یەكێك لە بەخششەكانی پەروەردگار لەسەر بەندەكانی لە دونیادا، لەمبارەیەوە

دەفەرمویێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾الأنعام/٩٩.

یان دەفەرمویێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ﴾ الأنعام/١٤١.

پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ۖ لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرْعَ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلْأَعْنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ النحل/١٠-١١.

هەروەها دەفەرمویێت: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾المؤمنون/١٨-١٩.

قورئانی پیرۆز هانمان دەدات بۆ تەماشاکردنی ئەم بەخششانە بە چاوی هۆشیارانە و دڵی ئارام و کراوەوە، وەك دەفەرمویێت: ﴿فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴾عبس/٢٤-٢٩.

ئایەتە پیرۆزەکان بەکۆ ئاماژە دەدەن کە دەرکردنی دارخورما و ڕووەکەکانی تر لە زەوییەوە لە بەڵگەکانن لەسەر توانا و دانایی و بەزەیی بێسنووری خوای گەورە.

لە یەکێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا کە خۆی لەخۆیدا بەپێشینەیەکی زانستی دادەنرێت، قورئان ئاماژە دەدات بە پەیوەندی نێوان ئاسانی لەدایکبوونی کۆرپەلە و خورمای پێگەیشتوو(رطب)دا، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴾مریم/٢٥، واتە: (ئەی مەریەم) ئەو دارخورمایە (کە پاڵت پێوە داوە) کەمێك ڕابوەشێنە خورمای گەییوت بەسەردا دەبارێنێت.

لە ئایەتە پیرۆزەکەوە پەیوەندییەك ئاشکرا دەکەین لەنێوان خواردنی خورمای گەییو (رطب) و ئاسانی لەدایکبوون، ئەگینا بۆچی خوای گەورە لەکاتی لەدایکبوونی عیسا پێغەمبەردا خورمای گەییو بۆ خۆراکی مەریەم هەڵدەبژێرێت (سەلامی خوایان لێبێت).

لەڕاستیدا ئەم ئایەتە ڕێنماییدەری زانایان بوو بۆ بایەخی خورمای گەییو بۆ ئەو ئافرەتانەی کەوتونەتە سەرژان، لەڕێی تاقیکردنەوە و شیکردنەوە زانستییەکانەوە سەلمێنراوە کە خورمای گەییو ماددەی وریاکەرەوە و چالاککەرەوەی تێدایە کە کاردەکاتە سەر بەهێزکردنی ماسولکەکانی منداڵدان لە مانگەکانی کۆتایی سکپڕیدا، هەروەها یارمەتی هاتنەوەیەکی منداڵدان دەدات لەکاتی لەدایکبوونەکەدا، لەهەمانکاتدا کەمکردنەوەی بڕی خوێنڕێشتن لەدوای لەدایکبوونەوە.

جیاواز لەو ڕووەكانەی تر كە لەقورئاندا ناویان براوە، ئاماژە بە چەند بەشێكی دارخورما دراوە، لەوانە: أكمام، جذع النخل، طلع، قنوان، نواة، نقرة، فتیل، قطمیر.

وەك چۆن لە دونیادا خورما یەكێكە لە بەخششەكانی خوای گەورە لەسەر بەندەكانی، بەهەمان شێوە یەكێكە لە بەخششەكانی بەهەشتیش، لەمبارەیەوە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ﴾ الرحمن/٦٨.

## ( ١٨ ) كولەكەئاوی ( الیقطین )

(یقطین) بە هەموو ڕووەكێك دەوترێت كە بەسەر زەویدا درێژدەبێتەوە، ئەگەرچی زۆرینەی خەڵك بە (كولەكە)ی دەڵێن.



زۆرینەی جۆرەكانی كولەكە گەڵای گەورەیان هەیە، گوڵی نێرە و مێیە بەرهەم دێنێت و تەنها گوڵە نێرەكان دەنكەهەڵاڵە (لقاح) هەڵدەگرن كە هەنگ بۆ گوڵە مێیەكانی دەگوێزێتەوە، لەپاشان گوڵە مێیە پیتراوەكان دەگۆڕێن بۆ بەر. بەری كولەكەئاوی بەگشتی گۆیی یان هێلكەیین. لەناو بەرەكەدا بۆشاییەك هەیە تۆوەكان دەپارێزێت. بەری زۆر لە جۆرەكانی كولەكەئاوی (یقطین) دەگەنە (٧-١٠كیلۆگرام). لەهەندێك حاڵەتدا كێشی كولەكەكە دەگاتە (٩٠ كیلۆگرام). زۆربەی بەرەكان ڕەنگیان پرتەقاڵییە، ئەگەرچی هەندێكیان سپی یان ڕەنگی تریان هەیە.

کولەکەئاوی سەرچاوەیەکی گرنگی پۆتاسیۆم و ڤیتامین (A)، هەروەها تۆوەکانی پرۆتین و ئاسنیان تێدایە، ئەمە و هەندێك لە کشتیاران ئەم ڕووەکە وەك ئالفی مەڕ و مالآت بەکاردێنن.

کولەکەئاوی پایەیەکی ناسراوی هەیە لە پزیشکی میللیدا، چارەسەری زۆر لەنەخۆشییەکانە.

## کولەکە (الیقطین) لەقورئانی پیرۆزدا

خوای گەورە لە میانەی چیرۆکی "یونس" پێغەمبەردا و لە سورەتی
(الصافّات)دا دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ
ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾
فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ فَنَبَذْنَٰهُ
بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ
أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾ الصافات/١٣٩-١٤٧، واتە: بەڕاستی (یونس)یش لە پێغەمبەرانە. کەچی بەرەو کەشتییە پڕ لە کەلوپەل و خەلکەکە ڕایکرد. ئەوسا بە ناچاری بەشداری قورعەی کرد، لەڕیزی ئەوانەدا بوو کە لە قورعەکەدا سەرنەکەوتن. ئینجا نەهەنگێك قوتیدان لەکاتێکدا کە شایانی سەرزەنشت و گلەیی بوو (چونکە پێش ئەوەی خوا مۆڵەتی بدات نەتەوەکەیی بەجێهێشت). خۆئەگەر لەو کەسانە نەبوایە کە تەسبیحات و یادی خوا دەکەن و نەیوتایە: ﴿پەروەردگارا! هیچ خوایەك نییە جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی و ستایش شایستەی تۆیە و من لە ستەمکارانم﴾، ئەوا لە سکی نەهەنگەکەدا دەمایەوە تا ڕۆژێك کە هەموان زیندوو دەکرێنەوە.

لـەوەودوا فرێماندایـە چـۆڵییەكی بـێ گـژوگیا و ڕووەك بێهێـز و مانـدوو و نـەخۆش. ئینجـا ڕووەكـی كولەكـەی گـەورەمان بـۆ پێگەیانـد. پاشـان گەڕانمانەوە و ڕەوانەمانكرد بە پێغەمبەرایەتی بۆ لای سـەد هـەزار كـەس و زیاتریش دەبن (كە نەتەوەكەیەتی).

لەڕاستیدا ئەوەی لەم چیرۆكەدا مەبەستە كولەكەئاوییە كە خوای گەورە بۆ "یونس" پێغەمبەری (سەلامی خوای لێبێت) پێگەیاندووە. هەندێك لـە زانایان وتوویانە: (یقطین) كۆمەڵێك ڕووەك دەگرێتەوە، وەك كولەكە، تاڵگە و كاڵەك و شوتی. هەنـدێك لـە ڕاڤـەكارانیش بـۆ ئـەوە چـوون كـە (یقطـین) بریتیـە لـە داری هـەنجیر، وتـراوە: ڕووەكـی مـۆزە، یـونس پێغەمبـەر بـە گەڵاكانی خۆی داپۆشیوە و لـەژێر لقەكانیـدا حەسـاوەتەوە و لـە بەرەكـەی خواردووە. بەڵام بۆچوونی كۆی ڕاڤەكاران لەسەر ئەوەیـە كـە مەبەسـت لـە (یقطین) بریتییە لە كولەكەئاوی.

هەنـدێك لـە ڕاڤـەكاران هەوڵیانـداوە هـۆی هەڵبـژاردنی ڕووەكـی كولەكـە دیاری بكەن كە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەكەی پێگەیاند. كـۆی ڕاڤـەكاران گەیشتنە نیمچە هاوڕاییەك لەسـەر ئـەوە كـە كولەكـە سـوودگەلێكی هەیـە، لەوانـە: خێرایـی ڕوان و پێگەیشـتنی، بەرەكـەی بـە كـاڵی و كـوڵاویش دەخورێت. سیفەتێكی تریش هەیـە بایـەخی لەوانـەی پێشـوو كـەمتر نییـە، ئەویش ئەوەیە كە مێش لە ڕووەكی كولەكەئاوی (یقطین) نزیك ناكەوێتەوە. پێویستە وێنای ئەو حاڵەتـە بكـەین دەبێـت كـام لـە نەخۆشـییەكان توشـی پێغەمبـەری خـوا یـونس (سـەلامی خـوای لێبێـت) ببێـت ئەگـەر لـەدوای دەرچوونی لە سكی نەهەنگەكە مێش هێرشی بۆ بكات؟ لەبەرئەوەی خـوای گەورە بەخشـندە و میهرەبانـە ناكرێت پێغەمبەرەكـەی لـە سكی نەهـەنگ ڕزگار بكات و بیخاتە بەردەم مێش.

# سەرچاوەكان

١. تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین
٢. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم، عبالرحیم الماردینی
٣. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم و السنة المطهرة، یوسف الحاج أحمد
٤. الموسوعة الذهبية في إعجاز القرآن الكريم و السنة المطهرة، د.أحمد مصطفی متولی
٥. موسوعة الإعجاز القرآنی في العلوم والطب و الفلك، د.نادیة طیارة
٦. عالم النبات في القرآن الكريم، د.عبدالمنعم فهیم الهادي و د.دینا محسن البركة

تێبینی:

ئەو ڕووەكانەی لە قورئاندا هاتووە، كە بەشێكی ئەم كتێبەیە، سەرجەمی بەشەكە لە كتێبی (عالم النبات في القرآن الكريم) وەرگێراوە.

جێی ئاماژەیە هەردوو نووسەری كتێبەكە ئاماژەیان بە دوو دانە ڕووەكی تر كردووە كە لێرە دانەنراوە لەبەرئەوەی بەتەواوی یەكلانەبوونەتەوە كە ئاماژەی ڕووەكە و ئێمەش بە پێویستمان نەزانی باسیان بكەین، ئەوانیش: (الخمط و المتكأ).